# وشەی پرشنگدار

● دەوری راستی ئافرەت بە بزوتنەوەیەکی عەفەوی یاخود لە بواری خۆبەدەستەوەدان بۆ رەوتی رۆژگارو چاوەڕێکردنی ئەنجامی بزوتنەوەو سوڕانەوەکەیدا وەدی‌نایەت بەڵکو ئەمە پێویستی بەکار تێککردنی کۆمەڵێك مەرجی خۆیەکی‌و بابەتی‌یانە هەیەکە حزبمان دەورێکی سەرکدانەی تێدا بگێڕێ بۆ ئەوەی گۆڕانێکی کامڵی شۆڕشگێڕانەو بازدانێکی جۆرەکی سەرتاپاگیر بۆ سوودو قازانجی ئەم هەنگاونانە بە دەر ئەنجامی حیسابکراوی بزوتنەوەی هەمەکی کۆمەڵ ببەخشێ .

سەلماندنی ئەمە وا ئەگەیەنی کە بە تەواوەتی‌و لەریشەوە رزگارکردنی ئافرەت،بە پێی ئەو بۆچوونەی باوەڕمان پێ‌یەتی بە هۆی رزگار کردنی تێکرای کۆمەڵ لەرووی سیاسی‌و ئابووری‌و روشنبیری‌یەوە ...هتد، ئەبی .

چونکە رزگارکردنی کۆمەڵ مەرجە بابەتی‌یەکانی رزگارکردنی ئافرەت دابین ئەکاتو .. لە کۆت‌و پێوەندی دواکەوتویی‌و پاشکەوتن رزگاری ئەکات ..

ئەمەش تەنیا بە یاسادانان بەدی نایەت ـ هەرچەندە ئەم یاسادانانەش بایەخی خۆی هەیە ـ چونکە پێشکەوتنی کاری شورشگێڕانە بەرەوپێش‌و کارتێکردنی بەردەوامی لە کۆمەڵدا ئە و بنەرەتەیە کە قەناعەت‌و بنەرەتی نەفسی یاسادانان‌و دانەری قانون‌و دەستور دابین ئەکات بۆ بەدی‌هێنانی گوڕان‌و بگرە هەر ئەوە لە سەرەتاوە پێویستی دەرکردنی ئەم یاسا یاخود ئەم بڕیارانە دەسەپێنێ .

وە لەبەر ئەوەی بیری نەتەوەیی‌و سوشیالیستی‌مان ئەو ـ منطلق ـ ەیە کە دەوری راستەقینەی ئافرەت لە کۆمەڵدا دەست‌نیشان ئەکات ، ئەوا ئێمە لە ـ مؤشر ـ ە کانیەوە دووپاتی ئەکەینەوە کە هەموو ـ تعبئە ـ کردنێکی میللی یاخود چالاکی‌یەکی کۆمەڵانی خەڵك بەکەم‌و کوڕیی‌ئەمێنێتەوە ئەگەر ئافرەت چالاکانەو بەجیددی بەشداری تێدا نەکات لە مەڵبەندە سروشتی یەکەی خۆیەوە بۆ بەتەنگەوە بوون بۆ توندو تۆڵی‌ی و پتەوی‌و بینای خێزان بینایەکی پتەوراست بەو شێوەیە کە شانەیەکی زیندوەو یەکێتی کۆمەڵ‌و سەرتاپاگیری‌یەکەی‌و هاوسەنگی بزوتنەوەکەی دەرئەبڕێت . ●

**هاورێ صدام حسین**
**لە دەربارەی شۆڕش‌و ئافرەت**

**بەرگی یەکەم : هاوینە هەواری جوندیان**

**بەرگی دووەم : تیپی موسیقای بێخودی منالان**

# لەم ژمارەیەدا




رۆشـنـبـیـری نـــوێ

گۆڤـارێـکـی گـشـتـی مـانـگـانـەیـە

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکـــات

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الفلاني بغداد

تەلەفۆن: ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرپەرشتکاری گشتی

سـعـاد اديـب

جێگری سەرنووسەر

فـائـق جـمـيـل

# دەقی وتارەکەی سەرۆك کۆمار هاوڕێ خەباتگێڕ صدام حسین

## بەبۆنەی جەژنەکانی تەمووزی نەمرەوە

## ئەرکی سەرشانمانەکە حەقپەرست بین و دژی ستەمکاری بجەنگین

بەناوی خوای گەورەوە میهرەبانەوە ..

هاوولاتیان ..

جەماوەرانی کەلەمەزبەکەمان ..

لەو یادە پیرۆزەدا .. یادی شۆڕشی گەلو .. شۆڕشی پیاوە تیکۆشەرە شەرەفمەندەکان .. لە ناخمەوە سلاوتان لیدەکەمو ئەمرۆ دوانە کە مدوانێکی رەسمی تەقلیدی نابێتو .. تیایدا باس لە کاروباری سیاسیو کاروباری کشتی وەك جاران ناکەم .. بەلکو دوانێکی تایبەتیو لە دلەوەیە .. بۆ گەلی مەزنی عیراقو .. بۆ نەتەوەی سەربەرزی عەرەب .

برایان رۆژی ئیوارەی یەکسەممەی رێکەوتی ١٦–٧

گوییتان لە وتاری باوکو .. سەربردەو .. هاوڕێی گەورە ( ابو هیثم ) بوو .. ئەوەی لە وتارەکەیدا هات شیوەیەکی تاکانە بوو لەنێوان هەموو تاقیکردنەوەکانی جیهانەوە .. ئەمرۆ منیش هەندێ لایەنی بنەڕەتی تری ئەو شێوەیەو.. لایەنەکانیو.. راستییەکانی .. کە پانزە سال درێژەی خایاند بۆتانی روون دەیکەمەوە .

**تاقیکردنەوەیەکی تاکانە**

گواستنەوەی دەسەلاتدارێتی لەسەرکردەیەکەوە بۆ سەرکردەیەکی ترو بە شێوەیەکی ئەخلاقیو بەشێوەیەکی دەستووری ئەبیعیانە کە لە ولاتو .. حزبو شۆڕشەکەماندا روویدا .. تاکە حالەتێکە لە جۆری خۆیدا لەنێوان تاقیکردنەوە کۆنو ٠تازەکانی .. جیهاندا .. تاکە حالەتێکە .. بەلام نامۆش نییە .. چونکە لە رەسەنایەتی نەتەوەی عەرەبو لە گەورەیی پەیامی ئیسلامدا ..لە بیروباوەڕەکانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست .. هەلگری مەشخەلێ بووژاندنەوەی ئەوە لە چەرخی ئیستاوە .. هەلهێنجێنراوە .. ئەمە دیاردەیەکی گونجاوە لەگەل تەبیعەتی رەوتی شۆڕشی هەقدەی تەمووزەوە بەهەموو کەنەبەرو لایەنەکانییەوە ،

بەدرێژایی رەوتی شۆڕشەوە لە مەسەلەی دەسەلادارێتییەوە وەکو بەعسییەکان ، وەکو نەرەی ئەو پیاوە مەزنانە .. کە گەشەشترین پەیامی

مرۆڤایەتیان گەیاندۆتە دوورترین قوژبنی زەوی و ٠ . باشترین نموونەی ئەخلاق و ٠٠ زیرەکی و ٠ ٠ سوارچاکیان نواند سات و سەودامان کردوە ٠٠ لەبەر ئەوە بەپێی بۆچوونمان دەسەڵاتدارێتی فەرمانڕەوابی و دەسەڵات گرتنە دەست و ٠٠ رازی کردنی خود نییە ٠٠ بەڵکو بارێکە بەسەر شانمانەوە هەڵمان گرتووە بۆ تەتبیعەکردنی بیروباوەڕەکان لەسەر زەمینێکی واقعییەوە لە پێناوی خزمەتی گەل و ٠٠ سەرخستنی نەتەوەو ٠ ٠ نەهێشتنی سەختی و مەینەتی بەسەریەوە ٠٠ برایانم ئەم بۆچوونەش ٠٠ سەرەڕای ئەو شتانەی کە لە سەرچاوەی هەڵقوڵانییەوە باسم کرد ٠ ٠ ئامێتەی تاقیکردنەوە دەوڵەمەندەکەی حزبەکەمانە لە عیراقداو ٠٠ بەتایبەتیشی تاقیکردنەوەی شۆڕشی رەمەزان ٠٠ لە دوایشیدا تاقیکردنەوەی حزبەکەمان لەمەیانی نەتەوەییدا ٠٠ ئەم تاقیکردنەوانە یارمەتیەك بوو بۆ ئێمە بۆ مسۆگەرکردنی ئەم بۆچوونەو ٠٠ دوورێکی بنەڕەتی بینی لە پاراستنمان لە هەڵخلیسکان و هەڵەکردندا٠



## گواستنەوەی دەسەڵات لە پێشەوایەکەوە بۆ پێشەوایەك بەو شێوەیەی لە حزبماندا کرا لە نێو تاقیکردنەوەکانی جیهاندا دەگمەنە

### قووڵیەتی پەیوەندییەکانی هاوڕێیایەتی

منیش بەو بۆنەیەوە بۆتان دەدوێم و ٠٠ باسی هەندێ لایەنی رەوتەکەمان و ٠ ٠ پەیوەندییەکانمان دەکەم ٠ ٠ دەتوانم بڵێم مەحاڵە وشە بگاتە ئەو ئاستەو بتوانێ تەعبیر لەو بیروباوەڕانەی کە هەڵمان گرتبوو ٠، لە قووڵیەتی پەیوەندی هاوڕێیایەتی و برایەتیمان بکات کە لەو ماوەیە دوورو درێژو پڕ لە خەتێکۆشانی سەخت و ٠٠ ئەرکی گران و ٠ ٠ رووبەروو بوونی پڕ مەترسناك و ٠٠ کرداری فراوان و ٠٠ سەرتاپاگیر لە هەموو کێلگەو مەیدانێکدا پێکەوە ژیاوین ٠ برایان ٠٠

یەکێك بووم لەو هاوڕێیانەی کە ئاگاداری چەند لایەنێکی بنەڕەت و گرنگ و ٠٠ بگرە بەشێوەیەکی دوورودرێژ لە تاقیکرونەوەی شۆڕشی رەمەزانی سالی ١٩٦٣ بوون ٠٠ دەرسەکانی ئەو شۆڕشەش دەرسی گەلێ دەوڵەمەندبوون

بە نیسبەت ئێمەوە . لەدوای ئەوەی هێزەکانی باشەگەزبوونەوە توانیان ئەم تاقیکردنەوەیە لە ١٨ تشرینی سالی ١٩٦٣دا لە بار ببەن .

لە دەرسە هەرەگرنگەکانیش کە فێری بووم و .. هاوڕێیان لە سەرکردایەتی و .. لە حزبدا فێری بوون .. ئەوە بوو کە نەبوونی پەیوەندیی بنەڕەتی هاوڕێیانەو .. پشتگوێ خستنی ئەو خوورەوشتانەی کە لە کەنەپووری باپیرە مەزنەکانمانەوە لەسات و سەوداکردن لەگەڵ مەسەلەی دەسەڵاتداریتی و تەنگوچەڵەمەکانیدا هەڵهێنجێنراون .. دەبێتە مایەی نوشوستی هەموو تاقیکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە .. هەتا ئەگەر بێت و لایەنی ئەمورەو پرشنگداری تری لە ناویدا هەبێ .

لە ژیانماندا وەك عیراقی و .. عەرەب و .. لە مێژووماندا بەدرێژایی هەزارەها سال .. بەهای مەعنەوی و .. ئەخلاقی .. تا ئێستاش .. ڕەگەزێکی بنەڕەت بووە لە ڕەگەزەکانی دەرچوون و سەرکەوتندا .

## بەها نوێیەکان

کاتێك کە بە پێی پایەمەوە لەسەرکردایەتی بەرپرسیاری بیناکردنی حزبم .. لەدوای پەرت و بڵاوبوونەوەی لەبەر پاشەگەزبوونە گرتەدەست .. هەمیشە خەمخۆری ئەوە بووم .. کە کاتێك حزبەکەمان لە قوتری عیراقدا شۆڕشەکەی لە دەست پاشەگەزبووەکان وەربگرێت .. پێویستە لەسەری کە بەهای تازە بخاتە ڕوو .. بەپێچەوانەی ڕەفتارە هەڵەو لادەرکانی هەندێ لەسەرکردە حزبییەکانەوە .. کە بووە هۆی لە دەستچوونی ئەو شۆڕشە مەزنەوە .

وەك ئەرکێکی پێویست بۆم دەرکەوت کە لە سەرمە هەندێ لایەنی ئەو بەهایانە بخەمە ڕوو . بۆ ئەوەی لە دوای سەرکەوتنی ئەو شۆڕشەی لە ئەو کاتە نەخشەکەمان دادەنا لە سەرکردایەتی و حزبدا پایەم نەبێ و تەنیا وەکو تێکۆشەرێك لەریزی حزبەوە بمێنم هەرچەندە بە شێوەیەکی مەوزووعیانە دەمزانی .. کە بەرپرسیاری شۆڕشگێڕیتی .. لەپاکیەتیدا بە قۆناغی خەباتی نهێنیدا نەبەستراوەو بەس .. هەروەها پویستییەکەی لە قۆناغێکدا .. چ لە ماوەی تێکۆشاندا بێت .. وەیاخود لە ماوەی بیناکردندا کۆتایی نایەت .

دەڵێم .. لەگەڵ ئەوەش کە ئەمەم دەزانی .. بۆم دەرکەوت لەسەرمە کە ئەرکی خۆم بەجێ بگەیەنم و ئەو بەهایانە بچەسپێنم .. لەو حاڵەتانەش ناچاری دەبێ نموونەیەکی زیندوو پێشکەش بکەی .. چاکترین نموونەش ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی پێشکەشی دەکات . ئەم بیروڕایانە بەشێوەیەکی ڕەسمی و بۆ یەکەم جار لەو کۆبوونەوەیە هاوبەشیەی کە لە نێوان سەرکردایەتی قوتری و مەکتەبی عەسکەری حزبدا لەمانگی ئەیلولی سالی ١٩٦٤دا کراو .. تایبەتی بوو بە دواسەرنجی نەخشەی شۆڕش کە دژی ڕژێمی پاشەگەزبوونەوەی عارفی ئامادەمان کردبوو خستە ڕوو .

ئەم بیروڕایانە لەو کۆبوونەوەیەدا خستمە بەردەم هاوڕێیان و پێم وتن .. من لە گەلتاندا دەبم هەتا کاتی سەرکەوتنی شۆڕش و هیچ مەرکەزێکی ڕەسمی لە ناو دەولەتدا وەرناگرم .. لەبەر ئەوە تکا دەکەم ئارەزووە هاوڕێیەتییەم بەجێ بگەیەنن و .. لە هۆیە بالپێوەنەرە ڕاستییەکانی بگەن .. بەڵام ئەم بگرەو بەردە توندو تیژەی کە دەربارەی کرا پالپێوەنام دەست لەم پێشنیارە هەڵگرم و .. فرمانەکەم خستە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە .. بەڵام ئێمە لەو کاتە یەدا لەبەجێ هێنانی نەخشەی شۆڕشدا سەرنەکەوتین .. لە بەر ئەو بارو دۆخە زانراوانەی کە کەمارۆی ڕووداوەکانداو ئێمە بە ڕووداوەکانی ٤ـ٩ـ١٩٦٤دا ناومان بردووە .

## نامەکەی هاوڕێ ـ ابو هیثم

جارێکی تریش ئەم بیرەم بەمێشکدا هات کاتێك لە سەرەتای سالی ١٩٦٦دا لە بەندیخانەی ژمارە (١)ی سوپایی بووم .. ئەوە بوو لە کاتی خۆیدا نامەیەکم لە هاوڕێ « آبو هیثم » ەوە پێ گەیشت تیایدا ئاگاداری کردم کە هاوڕێیان لە سەرکردایەتی خۆئامادەکردنی سەرەتاییان لا گەیشتووە بۆ پەرپاکردنی شۆڕش .. بەپێی

ئەو بۆچوون و ژماردنانەی کە لەو کاتەدا لە بەر دەمیاندا بوونە .. هەروەها کاتی بەرپاکردنی شۆڕشیش مانگی شوباتی ئەو ساڵە دەبێت .

منیش نامەیەکی دەستنووسم بۆ هاوڕێ ابو هیثم نارد تایدا پیرۆزباییم لێدەکرد بۆ ئەم کارەو هانیشم دەدا بۆ ئەنجامدانیو ختمە یادیو .. یادی هاوڕێیان ئەندامانی سەرکردایەتی تێیدا بەو مەبدەئانەی کە بەنجەم بۆ ڕاکێشانو .. داوایشم لێکرد ئارەزووی من بە ئەچوونە ژێر ئەستۆی هیچ لێپرسراویەکەوە بارتێنێتو .. ئەم ئەمرەیشم دووبارە بخرێتە پێش چاوی سەرکردایەتی دوای سەرکەوتنی شۆڕش و .. لە بەردی هاوڕێیانمدا ببێتە شایەتم بەرەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کەمن ئەوەم بەر لە بەرپابوونی شۆڕش داوا کردووە ..

هەروەها داوام لێکرد یارمەتیم بدات بۆ وەدیهێنانی ئەم ئارەزووە لەکاتی پیشاندانیدا .. بەڵام هەل بۆ حزب هەڵنەکەوت لەو کاتەدا شۆڕش بەرپا بکات .. ئەنجا خودا حزبەکەمانی لە حەڤدەی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨دا! سەرخست .. ئەو ساڵو گۆڕانەیشی پێدەزانن کە لەو ماوەیەی کەوتووەتە نێوان (١٧و٣٠) تەمووزەو ڕوویان دا .. لە کاتی خۆیدا نەتوانرا ئەم بیرە پیشان بدرێت .. چونکە پیشاندانی واتای ئەوەی دەگەیاند بەشێوەیەکی عەمەلی واز لەو ئەرکە تێکۆشانە خوا راوە بهێنرێت

کە پێویست بوو بەجێ بهێنرێت .. بۆ ئەوەی شۆڕش بخاتە سەر ئەو ڕێرەوەی کە حزب بۆی دیاری کردبوو .

دوای ئەوەی ئەرکی تێکۆشەرانەی خۆمانمان بەجێ‌هێنا بە پاککردنەوەی شۆڕش لەو تاقمە گومانلێکراوانەی کە هاتبوونە ریزی شۆڕشەوە.. سەر لەنوێ ئەم بیرەم لە نێوارەی سیی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا پیشاندایەوە .. بەڵام هاوڕێیان .. لەپێیش هەموویانەوە هاوڕێ ابو هیثم .. بەرەفزکردنی تەواوەتی بەرەنگارم بوونەوە .

لەگەڵ ئەوەی من لێپرسراوێتیی جێگای جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشم لە ڕۆژی سیی تەمووزەوە گرتە ئەستۆ .. لەلایەنی فیعلییەوە .. بەڵام لە گرنگترین ئەو هۆیانەی بوونە هۆی لەکارخستنی ڕاگەیاندنی پێکهێنانی ئەنجومەن .. بەهەموو ئەندامەکانیەوە .. ئارەزووم بەوەی بووکە لێپرسراوێتیی فیعلیم بەشێوەیەکی ڕەسمی ڕانەگەیەنرێت .. بۆ ئەوەی وازهێنانم لەم لێپرسراوییە ناهەموارییەکی کشنایان زیانێك بە ڕێرەوی حزبو شۆڕش نەگەیەنێت ئەگەر لە پاشەڕۆژدا ئەنجامم دا .

دوای پتر لە ساڵێك لەو مێژووەوە .. بەهۆی سووربوون لەسەر ئەوەی کە سەرکردایەتی حزب جێگای ڕاستەقینەی خۆی لەشۆڕشدا وەربگرێت لە لایەنی ڕەسمییەوە .. سەرەڕای لایەنی فیعلی .. دوای سوور لەسەربوونی هاوڕێیانو .

لەپێش هەموو یشیانەوە هاوڕێ ابو هیثم ناچار بووم بە ڕاگەیاندنی پێکهێنانی تەواوەتیو فیعلیی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و .. ڕاگەیاندنی لێپرسراوێتیی ڕەسمیم وەك جێگرێکی سەرۆکی ئەنجومەن قایل ببم .

لە بیرکردنەوە لەم شتە نەوەستام لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٧٤دا نەبێت .. لەو کاتانەدا .. بۆ دوایەمین جار هەوڵمدا واز لە لێپرسراوێتییەکانم بهێنم .. بەڵام ئەم هەوڵدانەیش بە ڕەفز لە لایەن هاوڕێیان لە هەردوو سەرکردایەتیی نەتەوایەتیو هەرێمایەتیو ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و لە پێش هەموو یشیانەوە هاوڕێ ابو هیثم بەرەنگار کرایەوە

ئیتر لەو مێژووەوە وام هەستدەکرد شتێکی گونجاو نییە جارێکیتر ئەم بیرە پێشچاو بخەمەوە چونکە تەواو لەو بڕوادا بووم .. هەروەها هاوڕێیانم لەم سەرکردایەتیدا .. کە وازهێنان لە لێپرسراوێتی دوای ئەو قۆناغەی کە شۆڕش بڕیویەوە .. شێوەیەکی دیاری وەرگرتووە لەوانەیە زیانی ترسناك بە ڕێرەوەکەی بگەیەنێت .. تا بەم جۆرە ئەم بیرکردنەوەم بەتەواوەتی پشتگوێ خست .

## سروشتی پەیوەندیی نێوان تێکۆشەران

ئەمانە . ئەی برایان .. چەند ڕاستی‌یەکن زۆر کەس لە حزبدا نایانزانن . . ئێوەیش هیچیان دەربارە نازانن .. تەنیا لە ناو سەرکردایەتی‌ی حزبو . ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش‌دا دەزانران .. بەڵام ئەمەیە ڕاستی .. ئەمەیش هەموو ئەو ڕاستی‌یە مرۆڤایەتی‌یە شەریفانە نوێیە کە بەبڕەویانمان دەکردو ..تیایدا لە ناسکترین بارودۆخو خرابترینیان لە ئاڵۆزی‌دا ، ئەمەیش ئەوەیە کە ووتەکەی دوێنی‌ی هاوڕێ ابو هیثم دووپاتی کردەوە .. کاتێك لە تێکۆشەران لە سەرکردایەتی- سروشتی پەیوەندی‌ی نێوان کردنی ئەم شۆڕشەو لە لێپرسراوێتی دووا .

لەبەر ئەوە دەبینین لە مێژووی کۆن‌دا .. لەوەیش مێژووی نەتەکەوەمان بە ڕووناککردنەوەکانی‌و لە مێژووی هاوچەرخ‌دا ڕووی نەداوە دوو سەرکردە لە دەستەلاتداریتی‌ی یەك سەکردایەتی‌دا هەبن .. بۆ ماوەی یازدە ساڵ .. بەو خاسیەتانەی دەیانزانن . بەبێ ئەوەی ئەوە ببێتە هۆی تێکچوونێکی ترسناك لە ڕێڕەودا .. لە لایەنی ئاکاری‌یەوە .. یان لەلایەنی عەمەلی‌یەوەو بەبێ ئەوەی پەیوەندی‌ی نێوانیان بەو جۆرە کۆتایی پێ‌بێت بەدوور خستنەوەی یەکێکیان .. بۆ ئەوەی ئەوی تریان بمێنێتەوە ..یان پەیوەندی‌یەکە ببێتە هۆی ئەوەی کە ژیانی سەرزەمینیمان هەبێت بۆ ئەوەی پشکێکی تایبەتیمان لە

ئەریتی ئاسمان‌و ..نەریتی مێژووی ڕووناك‌و شکۆدار هابێت ..ئەوە بوو بەدرێژای ئەم ڕێڕەوە نەریتی پیاوەتی‌و شەرفمان پاراست‌و هەموو پێداویستی‌یەکانی خۆشەویستی‌و ڕێزگرتنمان پێشکەش بە هاوڕێی گەورەو خۆشەویست ابو هیثم کرد کە ئەوپەڕی شایانیەتی .. وەك پیاوێکی دڵسۆز بۆ نیشتمان‌و نەتە نەتەوەکەی .. دڵسۆز بۆ حزب‌و مەبدەءو نەرتیەکانی .. چەندین خزمەتگوزاری‌ی بەرزی پێشکەش بە حزب‌و نیشتمان‌و نەتەوە کرد کە مێژوو بەوپەڕی ڕێزو پیا هەڵدانەوە باسیان لێوە دەکات .

تێکەڵ‌بوونی هەموو هێزە دژەکان‌و .. هەوڵدانە حراپەکانیان‌و .. هەموو هەلخەلەتێنەرەکانی دەستەلاتداریتی‌و ژیان ..نەیانتوانی وورووژم بردنمان بەرەو جێگای پێشەوەی دەستەلاتداریتی بۆ بنەخشێنن . . بەوەیش لەو مەبدەءو نەریتانە دوور دەکەوتینەوە کە پێیان پەروەردە بووین بەوەی لە پلەی سوارچاکی‌و ئاکاری عەرەب‌و .. نەریتی ڕووحی‌ی ئەمر بێ‌بەشی دەکردین .

ئەی برایان ئەوە بوو هاوڕێ ابو هیثم بۆی ڕوون- کردنەوە .. ئەوەی هەموو جارێك پێشانی دەداین کە ئارەزووی وازهێنانی لە لیپرسراوێتی هەیە بەهۆی باری تەندروستی‌یەوە . . هەموو جارێکیش پێش ئەو دەچوومە لای هاوڕێیان لە سەرکردایەتی بۆ ئەوەی

نەهێلم ئەوەی ڕووبدات‌و .. قسەیەکم دەووت لە ڕیزی سەرکردایەتی‌دا بووەتە قسە- یەك لە قسە باوەکان . . ئەویش ئەوەیە ئێمە دەبێت لەسەر ئەوە سووربین کە هاوڕێ ابو هیثم لەگەڵ خۆمان‌دا بهێلینەوە .. تا دوا هەناسەی لە ژیان‌دا .. وەك ڕەمزێکی تێکۆشانی گەورە..

ئەگەریش خوادانەکرە گەیشتە ڕادەی بێ‌توانایی . . نەتوانێت بەپێ ڕێ بکات ئەوا لەسەرمانە لەسەر شانمان هەڵیبگرین .. بۆ ئەوەی ئەم کارە ببێتە هیمایەك بۆ مەبدەئەکانمان‌و .. ببێتە وێنەیەکی پەروەردەیی بیدەینە حزبەکە- مان‌و گەلەکەمان‌و بۆ نەوەکانی داهاتوو .

## باری تەندروستی‌ی ابو هیثم

بەڵام سووربوونی هاوڕێ ابو هیثم ئەم جارە بەهۆی باری تەندروستیەوەی وای لێ‌کردین نەمانتوانی لەم ئارەزووەی لە وازهێنان لە لێپرسراوێتی‌ی ڕەسمی پاشگەزی بکەینەوە بەو جۆرە هەلی تەواوکردنی ئەو ئەرکەی لە دەست‌داین کە لەسەر ئەم ڕێگایەدا خستبوومانە ئەستۆمانەوەو بۆ خۆمانمان ویستبوو بۆ پترکردنی ئەو نەریتانەی کە ئارەزوومان لێ‌دەکردن لە پێناوی ئەوەی پترتر ئەو بۆچوونانە قووڵ بن کە ڕێڕەوی شۆڕش بە واتای مرۆڤایەتی‌یانەو ئاکاری‌یانە دەوڵەمەند دەکەن کە ئەم ڕێڕەوە مەزنە شایانین بەڵام ئەمەیە توانیومانە تاکوو

ئێستا لە سەر ئەم ڕێگایە پێی بگەین و هەڵی بەخششیش بۆ هەموو خێرویستو بەشەرەفەکان لە میانەکانی تردا ئاواڵەیەو .. ئێمە سوپاسی خودا دەکەین چونکە لە بەجێگەیاندنی ئەو ئەمانەتو پەراستنی مەبدەءو نەریتانە سەری خستین کە حزبە مەزنەکەمان پێی پەروەردەی کردین و لە گەیاندنی ئەم مەبدەئانەدا بە لێواری ئاسایش بۆ ئەوەی گەلەکەمان بەهۆی حزبە ئازاکەیەوە بتوانێت بەردەوامی بە ڕێڕەوە سەرکەوتووەکەی بدات بە هەموو شانازیو شکۆمەندیو بارمی بەخۆبوونێکی بەرزەوە.

ئێمە لە کاتێکدا دووبارە سوپاسی خودا دەکەین بۆ ئەوە ئەوا هەست بەو شانازییە دەکەین چونکە هاوڕێی خۆشەویستمان ابو هیثم کارێکی چاکو پڕ واتای قووڵی خستە سەر ئەم ڕێڕەوە مەزنەیەو خاڵێکی پرشنگداری تری خستە ناو تۆمارگە بەشکۆکەی خۆیەوە . ئەوەیە هاوڕێتان ابو هیثم وێنەیەکی نایابی بەخشی مێژوو بۆی لە بیر ناباتەوەو ئەویش لە لایەن ئێمە مانانەوە شایانی هەموو ڕێز لێگرتن و شانازی پێوە کردنێکە .

هاوڕێ ابو هیثم لێرسراوێتی ڕەسمیی لە حزبو لە دەوڵەتدا بەجێ هێشت بەڵام لە ناودڵماندا ئەو باوکە . ئەو سەرکردەو مرۆڤە بەشەرەفە مایەوە کە شانازی بە ژیانی تێکۆشانی دوورو درێژو ئەو خزمەتگوزارییە بەرزانەی بەدرێژایی ژیانی پڕ لە تێکۆشانی پێشکەشی حزبو نیشتمانو نەتەوەی کردن و .. من و هاوڕێیان ئەندامانی سەرکردایەتیو ئەنجومەن لە خودای مەزن داوا کارین تەندروستیی و لەش ساغیی پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی هەمیشە وەك هاوڕێو باوك لە گەڵماندا بێتو گەلی خۆشەویستمان کە هاوڕێ احمد حسن البکر بەدرێژایی ژیانی لە پێناوی ئازادیو سەربڵندیو سەرخستنیدا کاری دەکردو لەم پێناوەدا هیچ درێغی لە قوربانیدان نەکردووە ، هەمیشە بە چاوی ڕێزو سوپاسەوە تەماشای خزمەتگوزارییە نیشتمانیو نەتەوەییەکانی دەکات .

---

## هەست کردن بەشانازیو رەزامەندی

---

من هەست بە شانازیو ڕەزامەندی دەکەم بەوەی لە سەرڕێگای شەرەفو مەبدەئەکان بەدیمان هێنان هەست بەچاکە دەکەمو ڕێزا لە هاوڕێیانی خۆشەویست هاوڕێ عزەت ابراهیم جێگری ئەمینداری نهێنیٚ قوتریو هاوڕێیان لە سەرکردایەتیدا دەنێم ئەوانەی لە گەڵماندا بە توانایەکی مەزنو سوورن لەسەربوونێکی قووڵو هۆشیارییەکی ڕەسەنی پڕ لە واتای شەرەفو ئاکارو پێداویستییەکانی بەردەوام بوونی شۆڕش بەرەو ئامانجەکانی ئەو لێپرسراویو شەرەفە مەزنەیان گرتە ئەستۆ .

**برایینە ..**

**ئەوە بوو پێموتن کە ووتەیەکی تایبەتیتان ئاراستە دەکەمو تیایدا باسی مەسەلەی سیاسیو کاروباری گشتی ناکەم کە خودا یار بێت لەم بارەیەوە بەیەك گەیشتنێکی ترمان دەبێت .**

من ئەمڕۆ هەست بە خوشەویستی دەکەم بەوەی هاوڕێیانم لە سەرکردایەتی حزبو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا ئەو لێپرسراوێتییان خستە ئەستۆمەوەو هەست بە خۆشەویستی دەکەم بەوەی لە ڕۆڵەکانی گەلەوە خۆشەویستیی ڕیز لێگرتنیان پیشاندام بەدرێژایی ئەو ساڵانەی رابوردوو لە نێوانیاندا کارم کرد کە تیایدا منتان لە شوێنی پێشووی لێپرسراوێتیەوە ناسی .. لە خودا داواکارم یارمەتیم بدات لەم هەستەتان بێ بەشم نەکات لەم لێپرسراوێتییە نوێیەمدا .

---

## بەڵێنی تێکۆشەران

---

براینە ،

دیسانەوە کە من لێپرسراوێتی لە شوێنی ئێستامەوە دەگرمە ئەستۆ لە بەردەمتاندا ئەی عیراقییە سەربەرزەکان بەڵێنێك ڕادەگەیەنم کە بەڵێنی تێکۆشەرە بەشەرەفەکانە داوا لە هاوڕێیان لە سەرکردایەتیو حزبو برایانم ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ناکەم کارێك ئەنجام بدەن خۆم ئەنجامی نەدەم .. وایشیان

لێناکەم کارێك ئەنجـــــام نەدەم ٠٠ وایشیان لێناکـەم کارێك ئەنجام نەدەن کـــــە خۆم ئەنجامی دەدەم •

بەشێوەیەك کار دەکەم کـە بڕوای حزبو کەلەپـــووری نەتەوەی عەرەبو گیانـــی پەیامی ئاسمانی ئیلهامـمـــان پێدەدەن •

ئەرکمان ئەوەیە حــــەق پەرست بینو دژی ستەمکاری بجەنگینو٠٠ قبوولیش ناکەین کە هیچ تێکۆشەرێك لــــە حزبداو هەر هاوولاتی‌یـــەك لە ڕۆلەکانی گەل سەرکـــۆت بکرێت یان سەرشۆڕ بکرێـت ٠٠لە ستەمیش دەدەین لـــە شوێنەکانی‌داو ٠٠ لایەنـــی حەقیش دەگرین هەر کاتێـــك هانامان بۆ بهێنێت •

تێدەکۆشم بۆ ئەوەی ببمـە ئالایەك لە ناو ئالاکان‌دا هــەر جۆرێك بن ئەوەك تاکــــــە ئالایەك هەروەها شمشێرێـك لەناو شمشێرەکان‌دا نـــەوەك تاکە شمشێرێك هــــەروەها سەرکردەیەك لە نـــــاو سەرکردەکان‌دا نەك تاکـــــە سـەرکردەیەك هەروەهـــــا سوارچاکێك لە ناو سوارچـا‌کەکانی تێکۆشەرانی حـــزبو ڕۆلەنای گەل نەك تاکــــــە سوارچاکێك .

هیچ دوو دل نابم یـــان دواناکەوم لە دەستپێشکەریێو خستنە ئەستۆی لێپرسراوێتی سەرکردایی‌تی‌و بۆ پێشـــەوە بردنی‌و ٠٠ بەرەنکاربوونەوەی ئەرکە نیشتمانی‌و نەتەوەییەکان لەســـەر ڕێگای یەکێتـــی‌و سەربەستی‌و سۆشیالیستـی ٠٠ ئەوەیش دەخەمە پێـــش چاو کە گیانی دەسپێشکەری شۆڕشگێڕانە لـــە لێپرسراوی یەکەم دەیخوازێت لە چـوار چێوەی سەرکردایەتی کردنـی بــە کۆمـــەڵ‌دا کە بەهــەر تیکوشەریك دەوری خـــوی . دەداتو ئەرکی خۆی بـــۆ دەستنیشان دەکات .

ئەی برایانی هـــاوولاتی ٠٠ ئەی تێکۆشەرە بەعسیەکـــان لە هەموو شوێنێك نـەمـــە بەلێنێکـــە لەبەردەمتان‌دا ٠٠ بەلێنـــی پیـــاوانو بەلێنی تێکۆشەرانە ٠٠ بـــۆ ئەمڕۆو بۆ دوارۆژ دەیدەینو ٠٠ لـــە خودا داواکاریـــن کــــــە یارمەتیمان بداتو سەرمـــان بخات تاکوو بـــەجیێ بهێنینو داوایێ لێدەکەین کە باوکـــی خۆشەویست سەرکردە احمد حسن البکرمان بــــــۆ بپارێزێتو تەمەنی درێژ بکاتو لێشی دواودەکەم بتانپارێزێتو چاودێریتان بکاتو لایەنتـــان بگرێت « انه السمع المجیب »

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته .

# عــراق هــەمیشەبەدەنگ بزوتنەوەی بی لایەنییەوەیە

هاڤانا

سەرۆکی فەرماندە صدام حسین

# با رێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین

## دوایە بەش

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

له پێشدا ئەوە دەخەمە بەرچاو کە د. ئەبەز بۆ سەلماندنی ڕا ناڕەواکەی لە ڕەتکردنەوەی زاراوەکانی کۆڕدا ، لە هەر لیستەیەکی ئەو شەش لیستە زاراوانەی ، کۆڕ لە سەرەتای دامەزرانیەوە تا ئەمڕۆ بڵاوی کردوونەتەوە ، چەند نموونەیەکی ئێجگار کەمی هێناوەتەوە . بەوێنە (١٣) وشەی لە لیستەی یەکەم وەرگرتووە ، کە بە لای ئەوەوە نادروستن ... بەڵام سەیر هەر ئەوە نی‌یە کە بەڵگەی د. ئەبەز لە ڕەتکردنەوەی (١٤٠٠) زاراوەیەکی لیستەی ناوبراودا تەنیا (١٣) نموونەیە ، بەڵکو ئەوەشە کە لە بەشێکی ئەو چەند نموونە کەمەدا خۆی بە هەڵەدا چووە یاخود لە جێی هەڵەکانی کۆڕ هیچی باشتری دانەناوە. چۆن د. ئەبەز ئەو مافەی بە خۆی داوە کە بە (١٣) نموونەی نالەبارەوە کە خۆی لە هەندێکیاندا بەهەڵەدا چووە ، ( ١٤٠٠ ) زاراوەیەك بە خراپ دانێ ؟ ... خۆ ئەگەر هەموو نموونەکانیشی ڕاست بن ، ئەوە (١ ٪) ی ئەو ژمارەیە دەرناچن و ئنجا هەر ناشتوانن ببنە بەڵگەی ڕەتکردنەوەی ئەو خەرمانە .

لیستەی چوارەم کە نزیکەی (٥٠٠) زاراوەیەك دەبێ ، د. ئەبەز تەنیا (٤) نموونەی لێوە هێناوەتەوە . سەرەڕای ئەوەش کە تەنیا ئەو چوار زاراوەیەی کۆڕی بە لاوە ڕاست نی‌یە ، کەچی خۆی تەنیا بۆ یەکێکیان پێشنیاری زاراوەیەکی‌تری کردووە ، کە ئەویش تەواو تێیدا بە هەڵە چووە .

ئەو زاراوەیەش ئەوەیە کە کۆڕ ( نەمان )ی بەرانبەر ( انعدام ) داناوە و د. ئەبەز بە ڕاستی لە قەڵەم ناداو ( نەبوونی ) بە لەبار دەزانێ ( ل ١٠٤ ) . من لەو ڕایەدام کە کۆڕ بە هەڵە چووەو ( نەمان ) — ( انعدام ) نی‌یە ، بەڵام ئەوەی د. ئەبەز وتویە ، ئەویش هەر ڕاست نی‌یە ، چونکە وەك ئاشکرایە ( نەبوونی ) — ( فقر ، عوز ) ە ، نەك ( انعدام ) لیستەیەك کە دەوروبەری (٤٠٠) زاراوەیەك بێت ، چۆن بە چوار نموونەی سادە و ساکار بە خراپ دادەنرێ ؟ ... جا نەك هەر ئەو چەند نموونە کەمە بێ‌بایەخە ، بەڵکو هەڵە و هیچ پێشنیار نەکردن‌و بێ‌ویژدانی‌ی خاوەنی ئەو نووسینە ، دوژمنایەتی کردنی لەژێر پەردەی ڕەخنەگرتن‌و دڵسۆزی‌دا دەکاتە بڵقی سەر ئاو .

لیستەی پێنجەم کە دەوروبەری (٣٠٠) وشە دەبێ ، تەنیا (٢) وشەی بەنموونە لێوە هێناوەتەوە .

ئەو دوو وشەیەش یەکەمیان ـ ئەوەیە کە دەڵێ : ڕاست نی یە کە کۆڕ بۆ ( مانی ) ـ ( ئاوەکی ) داناوە ، « چونکە ( ئاوەکی ) بە شتێك دەڵێن کە لە نێو شتێکی دیدا توابێتەوە » ( ل ١٠٤ ) . هەرچەندە ئەمە ڕاستە،بەڵام ڕەخنەگر خۆی هیچی پێشنیاز نەکردووە لە جێی ( ئاوەکی ) دابنرێ ... دووەمیشیان ـ دەڵێ لە لیستەی پێنجەمدا « بۆ ( شراع ) ـ ( بایەوان ) نووسراوە . وە لە پاڵی‌یەوە نووسراوە ماوەیەکە بەکار دێ . ئەم وشەیە بۆ یەکەم جار لە ( چیرۆکی گەرداوەکە ) دا بەکارهێنراوە . بەڵام کۆڕ باسی نەکردووە » ( ل ١٠٤ ) لەمەدا گلەیی ئەوەیە کە کۆڕ نەیووتووە ، کە زاراوەی ( بایەوان ) بۆ یەکەم جار د. نەبەز بەکاری هێناوە . لێرەدا هەر کەسێك بکرێتە حەکەم ، بێ بیرکردنەوە ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە ئەو دوو نموونە لاوازەی د. نەبەز ناتوانن ببنە بەڵگەی بە خراپ دانانی (٣٠٠) زاراوە .

**د. نەبەز لیستەکانی دیشی هەر بەو چەشنە نازانستانەیە هەڵسەنگاندووە . ئەوەی پتر جێگەی داغ بێ ، ئەوەیە کە سەرەڕای ئەو هەڵسەنگاندنە دوور لە زانستە ، هێشتا توانجی گرتۆتە زاراوەکان و ئەو کەسانەی لە دانانیاندا خۆیان ماندوو کردووە ... با چەند نموونەیەکی ئەو توانجە ناڕەوایانە بخەمە پێش چاوی خوێنەر ، هەتا حوکمی خۆی بدا :**

د. نەبەز لە کۆتایی ڕەخنەی زاراوەی ( توجیه ) دا دەڵێ : « مەگەر ئەوەی کۆڕ بە قوورەتی خۆی زمانێکی تازەمان بۆ بنیاد بنێ » ( ل ١٠٠ ) ، لە لێبوونەوەی باسی زاراوەی ( توازن )دا نووسیوێتی : « ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئەوانەی ئەمەیان داناوە سەریان لە عەرەبیش دەرنەچووە ، چ جایەکی کوردی‌یەکەی خۆیان » ( ل ٩٩ ) ، لە ناوەڕاستی باسی زاراوەی ( لفظ ) دا وتوویە : « وا دیارە ئەوانەی ئەمەیان داناوە ... بیری ئەوەشیان نەبووە کە ( لفظ ) یان بە سێ جۆر پێ فرۆشتووین » ( ل ٩٩ ) ، لە سەرەتای لێدوانی لە زاراوەکانی فەلسەفەدا ، ئەم وشانەی تۆمارکردووە : « زاراوەکانی کەلسەفە ، یەکجار ناشی‌یانە دروستکراوەتو بە جۆرێك دڵ دەشێوێنن تەنانەت ئەوانەی زۆر حەز لە فەلسەفە دەکەن ، فەلسەفەشیان لە بەر چاو دەکەوێ » ( ل ١٠٥ ) .

گەلێ ڕەخنە و سەرنج و قسەی ترم لەسەر ئەوەی د. نەبەز دەربارەی زاراوەکانی کۆڕ و باسەکانی دی نووسیوێتی ، هەیە ، بەڵام نەك هەر لەبەر ئەوەی هەست بە بەفیڕۆدانی کات دەکەم لەم نووسینەدا ، بەڵکو دەبینم ئەگەر بەو پێیە بڕۆم ، ئەوە هەویرەکە ئاو زۆر دەکێشێ. جا بۆیە لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم لەو باسانەی کە ماون ، هەندێکیان پشتگوێ خەم و هەڵیانگرم بۆ دەرفەتێکی‌تر . ئەو بەشەش کە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشم زۆر بەکورتی لێیان دەدوێم .

**بەو پێیە ئێستا کە دێمە سەر لێکۆڵینەوەی سەرنجەکانی.د. نەبەز کە لە بارەی تاکە تاکەی زاراوەکانی کۆڕەوە نووسیونی ، تەنیا دوو سێ نموونەیان لێ دێنمەوە :**

بۆ ئەوەی لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا ، ( پرسگە ) بەرانبەر ( استعلامات ) دانراوە ، د. نەبەز دەڵێ : « لە جیاتی ( استعلامات ) ـ (پرسگە) دانراوە . ( استعلامات ) لە زمانی عەرەبی‌دا کەل ( جمع ) ی ( استعلام ) ە . بەڵام ( پرسگە ) جێی پرسی درایە . لەبەر ئەوە ( پرسگە ) دەبێتە ( محل الاستعلامات ) یا ( دائرة الاستعلامات ) نەك ( استعلامات ) » ( ل ٩٦ ـ ٩٧ ) .

بێ‌گومان کە لە شوێنێك دەنووسرێ ( استعلامات ) ، ئەوە مەبەست ( شوێنی پرسین )ە . ئەم چاوگە کە لە شێوەی کۆدایە بەتەنیا ناو نی‌یە بۆ ئەو شوێنە ، بەڵکو لە تەقدیری ( دائرة الاستعلامات ) دایە . هەر بەو جۆرە کە لە سەر ( ژووری مامۆستایان ) دەنووسرێ ( المدرسون ) ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بە تەنیا ناوە بۆ ئەو شوێنە ، بەڵکو لە تەقدیری ( ژووری مامۆستایان ) ە . هەر لەبەر ئەوەشە کە لە هیچ شوێنێك نابینرێ بە کوردی لە سەر ( ژووری مامۆستایان ) تەنیا وشەی ( مامۆستایان ) نووسرابێ ، چونکە ئەمە لەگەڵ خاسیەتی زمانی کوردی‌دا ناگونجێ ... لە فەرزێکدا ( پرس ) تەرجومەی ( استعلام ) یش بێ شتێکی دروستە ، چونکە ( است ) لە بابی ( استفعال ) دا زۆر جار بۆ ( طلب ) ە ، وەکو ( استفهام ) ـ واتە ( طلب الفهم ) ، ( استعلام ) ـ ( طلب العلم بشیء ) . کە وابوو لە گەڵ ( پرس )دا یەك دەگرنەوە ، چونکە ( پرس ) یش ( طلب العلم بشیء ) ە . ئنجا (استعلام) کە ناوی واتایە ( ئەبستراکتە ) ڕاستە لەگەڵ ( پرسگە ) دا هاوڕیزە نین ، چونکە ( استعلام ) وەکو وتم ناوی واتا و چاوگە کە مانای کات و شوێن نادات ، بەڵام ( پرسگە ) بە هۆی پاشگری ( گە ) وە بووە بە ناوی شوێن ( شوێنی

پرسین ) ـ ( مکان طلب العلم بشیء ) کە وەکو لە پێشەوە وتم عەرەبی یەکەشی هەر مەبەستی ( مکان الاستعلامات ) ە ، چونکە خەڵکەکەی کە پرسیان لێ دەکرێ و ئەو شوێنەی ئەوانی لێ دادەنیشن ئەوە مەبەستە . جا ئەمە دەبێ لە سەر شوێنێك بنووسرێ، لەبەر ئەوە لە هەموو حاڵەتێکدا شوێنەکە بە بیردا دێ . بەویێیە هەرچەندە کۆڕ مەبەستی وەرگێران نەبووە ، بەڵام هەردوو زاراوەکە ـ واتە کوردی و عەرەبییەکە ـ لە مەبەستدا تەواو یەك دەگرنەوە ...
سەرەڕای ئەوە دوو تێبینیدیش بەرانبەر ئەو ڕەخنەیەی د. نەبەز لە ( پرسگە ) ی گرتووە ، دەخەمە پێش چاو :

**١ ـ بەر لە هەموو شتێك مەسەلەی زاراوە تەنیا وەرگێران نییە ، بەڵکو گەڕانو دۆزینەوەو هەڵبژاردنو دانانو داڕشتنو ... یشە . بەڵام بەداخەوە لێرەدا د. نەبەز هەر لە ڕووی وەرگێرانەوە سەیری زاراوەی ناوبراوی کردووە .**

٢ ـ د. نەبەز ئەوە بە باش نازانێ کە کۆڕ ( پرسگە ) ی بۆ ( استعلامات ) داناوە ، کەچی خۆشی نەك هەر شتێکی باشتر ، بەڵکو هیچیشی لە جێگەی پێشنیاز نەکردووە .

لە لاپەڕە ( ٩٨ ) دا د. نەبەز نووسیوێتی : بۆ ( تعویض ) ( بژاردن ) نووسراوە . ( بژاردن ) ـ ( تنقیح ) ە نەك ( تعویض ) . ( تعویض ) ـ ( بژاردنەوە ) یە . کورد دەڵێ : ( هەمووی پێ دەژمێرمەوە ) » . ڕاستە ( بژاردن ) بە مانای ( تنقیح ) دێت ، وەك کورد دەڵێ : ( خانم برنج دەبژێرێ ) . جگە لە ( بژاردن ) ، هەروەها (بژار)یش بەکاردەهێنرێ ، کە نە کۆڕ و نە د. نەبەز ناویان نەبردووە . جا هەردوو وشە ـ ( بژاردن ) و (بژار)ـ بەرانبەر ( تنقیح ) دەوەستن ، بەڵام هەر یەکەیان بۆ شتێك ، بەوێنە ( بژاردن ) بۆ ( برنجو ساوەرو ...)، هەرچی (بژار)یشە بۆ ( باخو مەزراو ... ) ...
سەرەڕای ئەوە کورد ( بژاردن ) بۆ ( تعویض ) یش بەکاردێنێ ، بەبۆنموونە دەڵێ : ( ئەگەر بیشکێنی پێت دەبژێرم ، ( چی زیان لێ کەوتبوو ، هەموویان بۆ بژارد .. من وای بۆ دەچم د . نەبەز لەوەدا ڕاستە نەبێ کە ( بژاردنەوە ) بۆ ( تعویض ) دادەنێ ، چونکە من بەش بەحاڵی خۆم وشەی ( بژاردنەوە )م نەبیستووە و مەگەر تەنیا بۆ دووپاتکردنەوەی ( تعویض ) هەبێ . خۆ د. نەبەز لە کۆتایی ئەم ڕەخنەیەدا پتر کەوتۆتە هەڵەوە ، ئەویش ئەویە کە ( هەمووی پێ دەژمێرمەوە ) ی کردووە بە نموونەی سەلماندنی بوونی زاراوەی ( بژاردنەوە ) بە واتای ( تعویض ) . لێرەدا ( دەژمێرمەوە ) لە ( ژمـاردن ، ژمێردن ) ەوە وەرگیراوە ، نەك لە ( بژاردن ) ەوە . بەمەدا وا دەردەکەوێ کە د. نەبەز هەستی بە جیاوازیی ئەو دوو وشەیە ـ واتە ( بژاردن ) و ( ژماردن ) ناکات .

بۆئەوەی کە کۆڕ ( بناغە )ی بەرانبەرو ( اساس البناء ) داناوە ، نەبەز دەڵێ : ڕاستییەکەی (بناخە )یە ( ل ١٠١ ) . هەرچەندە گومان لەوە ناکرێ کە زۆر جار کورد دەنگی (غ) دەکاتە (خ) . ، بەڵام نابێ ئەو ڕاستییەش لەبیر بکرێ کە هەندێ جار نایکاتە (خ) . وشەی ( بناغە ) ش یەکێکە لەو وشانەی کە ڕەنگە بەدەگمەن کەسانێك هەبن بڵێن ( بناخە ) . جا کە کورد بڵێ ( بناغـە ) ، ئیتر بە تۆبزی چۆن گۆڕانی بەسەردا دەهێنرێ .

لە ڕەخنەی ئەوەدا کە کۆڕ ( دەرامەت ) ی بۆ ( الحاصل ) داناوە ، د. نەبەز دەڵێ : « دەرامـەت ) کوردی نییە ، لە ( در ) و ( آمد ) ی فارسییەوە هاتووە » ( ل ١٠٤ ) . ( دەرامەت ) با کوردیش نەبێ ، بەڵام کورد بەکاریدێنێو سەرەڕای ئەوەش خۆ د. نەبەز شتێکی باشتری لە جێی دانەناوەو کوردی سەدان وشەی لەمچەشنەی تێدایە کە هەردوو گەل بەکاریدێنن .

ئەوەش بەرچاو دەکەوێ ، د. نەبەز ڕەخنە لە نادروستیی زاراوەیەك دەگرێ کەدواتر کۆڕ بە سەریا چووەتەوەو ڕاستیکردۆتەوە . بەوێنە د. نەبەز دەڵێ : لە زاراوەکانـی کۆڕدا « بۆ ( تضامن ) ـ ( هاوئەرك ) و بۆ ( متضامن ) ـ ( هاوئەرکی ) دانراوە. هەردووکیان بەپێچەوانەوە بەکارهێنراون » ( ل ٩٨ ). بەڵێ ڕای د. نەبەز ڕاستەو دەبوو بۆ ( تضامن ) ـ ( هاوئەرکی ) و بۆ ( متضامن ) ـ ( هاوئەرك ) بەکاربهێنرێن . بەڵام دەبوو د. نەبەز لەوە ئاگادار بێ کە ئەو هەڵەیەی ئەو تازە پەنجەی بۆ ڕادەکێشێ ، کۆڕ پێنج ساڵ لەمەوبەر ڕاستیکردۆتەوە . (٦٦)

**د. نەبەز هەندێ جار ڕەخنەی بەجێی گرتووەو هەڵەی زەقی زاراوەکانی کۆڕی خستۆتە پێش چاو ، بەڵام کەمو کورتیی ڕەخنەگر لەو جۆرە شوێنانەدا ئەوەیە کە خۆشی شتێکی باشتری بەبیردا نەهاتووە .**
بەوێنە د. نەبەز لەوەدا زۆر ڕاستە کە دەڵێ : « بۆ

( عدم محكومية ) ـ ( بێتاوانی ) دانراوه ، ( عدم محكومية ) باریکی قانوونی‌یه بۆ ناساندنی حاڵەتی کەسێك لەلایەن دادگاوه حوکم نەدرابێ بەسەری‌دا . ( بێتاوان ) مانای نەبوونی تاوانه . هەر کەسێك حوکم‌درا بەسەری‌دا مەرج نی‌یه لە بنەڕەتدا بێتاوان بێ . ( بێتاوانی ) مانای ( بێجورمی ) یه » ( ل ٩٧ ). کەچی خۆی بۆ ( عدم محكومية ) هیچی پێشنیار نەکردووه . بێگومان ئەرکی ڕەخنەگر هەر ئەوه نی‌یه هەڵه لە ڕیز دەربێنێ ، بەڵکو پێویسته جێگەی ئەو هەڵانەش بە شتی ڕاست پڕبکاتەوه .

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ، ڕاست نی‌یه ئەوه لەیاد بکرێ ، کە د. نەبەز چەند زاراوەیەکی لەباری لەجێی زاراوەی نادروستی کۆڕ داناوه . بۆ نموونه که دەڵێ لە زاراوەکانی کۆڕدا : « لەجیاتی ( محو الامية ) ـ ( نەهێشتنی بێسەوادی ) دانراوه . ( بێسەوادی ) لە ( بیسوادی ) ی فارسی‌یەوه وەرگیراوه کە ئەویش لە ( بی ) ی ئێرانی‌و ( سواد )ی عەرەبی‌یەوه هاتووه . ( سواد ) مانای ( ڕەشایی )یه بە عەرەبی . ئێناگەم ئێمه لەکوێوه بەرامبەر (امی) ـ ( نەخوێندەوار ) و بەرامبەر ( امية ) ـ ( نەخوێندەواری ) مان هەیه ؛ بۆچی دەبێ بنیشین بە (بێسەوادی) یەکی نیوه فارسی‌و نیوه عەرەبی‌یەوه؟. » ( ل ٩٨ ) ، ئەوه ئاشکرا دەردەکەوێ کە کۆڕ بەهەڵەدا چووەو ئەوەی د. نەبەز وتوویه ڕاسته ... هەروەها ئەو نموونەیەی کە دەڵێ : « بۆ ( قطب ) ـ ( تەوره ) دانراوه . ( تەوره ) لەکوردی‌دا بۆ ( محور ) بەکاردێ نەك بۆ ( قطب ) . ئەگەر بە هوردی سەرنجی ( تەورەی دەستاڕ ) بدەین ئەم ڕاستی‌یەمان بۆ دەردەکەوێ » ( ل ١٠٠ ) دەتوانێ ببێته بەڵگەی ڕەخنەی ڕاست‌و دروست ...

نەك تەنیا لە باسی زاراوەکاندا ، بەڵکو تلوناوه لە باسەکانی دیشدا د. نەبەز ڕەخنەی بەجێی گرتووه، بەڵام بەداخەوه ئەو جۆره ڕەخنانه ئێجگار کەمن . لەگەڵ ئەو کەمی‌یەشدا باس‌نەکردنیان بە شتێکی ناڕەوا دەزانم، بۆیەکا ئێستا لەو چەشنه بیرو ڕایانەش دەدوێم :

د. نەبەز لەسەر هەستنەکردن بە بوونی بزوێنی ( أ ) ڕەخنەیەکی زۆر بەجێی لە د. نەسرین فەخری گرتووه کە وای‌دانلوه لە چاوگی وەك (کردن)و (ڕستن)دا ، ( د ) و ( ت ) پیش ( ن )ی چاوگی دەکەون ، چونکه وەك ئاشکرایه ( ن ) ی چاوگی

هیچ‌کاتێك دەنگی کۆنسۆنانتی ناکەوێته پێشەوه ( ل ٨٨ ) . ڕاسته ڕواڵەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی‌و نەبوونی وێنەی ( أ ) تێیدا ، سەری لە د. نەسرین تێکداوه ... بەڵام ئایا وتاری ناوبراو تەنیا ئەو هەڵەیەی تێدایه ؟ یاخود بەپێچەوانەوه دەبێ هیچی ئەوتۆی تێدا نەبێ کە شایانی باس بێ؟... جا هەرچەنده د. نەبەز هەڵەیەکی زانستی زەقی د. نەسرینی خستۆته پێش چاو ، بەڵام تاکه هەڵەیەك نابێته بەڵگەی ڕەتکردنەوەی وتارێك .

**دەربارەی وتاری « سەید جەمالوددینی ئەفغانی »ی شێخ محەمەدی خاڵ ( ٦٧ ) ، زۆر ڕاسته کە دەڵێ : « ئەم باسه چەند جار لە گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبه عەرەبی‌و فارسی‌یەکاندا بڵاوکراونەته وه ... جێی ئەو وتاره گۆڤاری کۆڕ نەبوو » ( ل ٩٠ ـ ٩١ )** . منیش دەڵێم : ئەو باسه پەیوەندی بە کوردو کولتووری کوردەوه نی‌یەو سەرەڕای ئەوەش لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نی‌یەو تەنیا گێڕانەوەیەکی سادەو ساکاری سەرگوزشتەی ژیانی جەمالودینی ئەفغانی‌یەو لەسەر هەموو ئەوەشەوه لەم کتێب‌و لەو کتێب‌و لەم وتارو لەو وتار وەرگیراوه .... بەڕاستی کۆڕ بە هیچ چەشنێك نەدەبوو ئەو وتاره بڵاوبکاتەوه .

د. نەبەز کاتێ دەربارەی وتاری « لەکوێوه دەستبکەین بە دەستوورسازی ڕێزمانی کوردی »ی د. پاکیزه ڕەفیق حیلمی (٦٨) دواوه ، زۆر ڕاست بۆ ئەوه چووه کە « ئەو وتاره (٦٩) لاپەڕەیی‌یەی د. پاکیزه ڕەفیق حیلمی نووسیوێتی لەبارەی دەستووری زمانی کوردی‌یەوه ، کە لەکوێوه دەست پێ بکاو دەست پێ نەکاو لەوێشەوه کەوتووەته باسی ئاڤێستاو هێندێ ئەلفوبێی ئاڤێستایشی بۆ نووسیوینەتەوه ، جارێ ئەگەر وتارەکە بۆ ئەوەیە باسی ئاڤێستا بکرێ ، ئەوا باسی ئاڤێستا لە دەیان‌و بگره سەدان کتێبدا بە ـ زمانی جۆر جۆر کراوه . پیاو دەتوانێ بیان‌کا بە کوردی‌و بە کتێب بڵاویان بکاتەوه . خۆ ئەگەر باسەکە بۆ ئەوەیه ( کە دەشیا وابێ ) پێوەندیی زمانی کوردی بە ئاڤێستایی‌یەوه بخاته بەرچاو ، ئەوا ئەو وتاره هیچ دۆزینەوەیەکی نوێ ، یا پێوەندی‌یەکی تازه دۆزراوەی ڕێزمانی کوردی بە ئاڤێستایی‌یەوه ناخاته بەرچاو . وەگێڕان لە زمانی بێگانەوه پێی‌ناڵێن لێکۆڵینەوه . لێکۆڵینەوه مانای وایه شتی تازه بابەت بهێنرێته کایەوه » ( ل ٩٠ ) .

**با لەوە گەڕێین کە د. پاکیزە لەم بەرهەمەدا پێوەندی زمانی کوردیی بە ئاویستایی‌یەوە نیشان نەداوە ، کە لەڕاستیدا دەبوو ئەوە ڕەچاو بکا . ئنجا نووسەری وتار هیچ خۆی بە لێکۆڵینەوەوە خەریك نەکردووە ، تەنها لەملاو لەولا هەندێ زانیاری وەرگرتووەو وەری‌گێراوەتە سەر زمانی کوردی . جگە لەوە ئەوەی ئەو کردوویە بە کوردی نەك تنۆکێکە لەو دەریایەی لەبارەی ئاویستاوە بە زمانی جۆر نووسراوە ، بەڵکو زانیاری‌یەکی سەرەتایی‌و سادەو ساکاری ئەو مەیدانەیە .** سەرەڕای هەموو ئەوەش ، جێگەی ڕەخنەیە کە بەشی زۆری ئەو باسانەی لە سەرچاوەی جیاوازەوە وەری‌گرتووە ، بە موڵکی خۆی داناوە . بەوێنە بێ‌دەستکاری چەند سەرباسێك‌و چەند باسێکی لە کتێبەکەی ( س. ن. سۆکۆلۆف )ەوە (٦٩) کردۆتە کوردی‌و هیچ پەنجەی بۆ ڕانەکێشاوە ... وە ئەو چەند وتارە کەمەش کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا بڵاوی کردۆتەوە ، ئنجاخۆش هەڵەی زمانەوانی ئەوتۆی کردووە کە یەکێك کەمێك شارەزایی لە زانستی زماندا هەبێ ، ئەو جۆرە هەڵانە ناکات . بۆنموونە لە وتاری « بووژاندنەوەی زمان » دا (٧٣) لە وشەی ( سووتاندی ، خنکاندی ، جووڵاندی ، ڕووخاندی ... )دا پاشگری (اند)ی بە ناوگر زانیوە ، ئەویش تەنیا لەبەرئەوەی بەدوایدا مۆرفێمی (ی( هاتووە (٧٤) . بێ‌گومان ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیەو ( اند ) بە هیچ جۆرێك ناوگر نی‌یەو لەگەڵ تەعریف‌و دەوری ناوگردا ناگونجێ . لە نموونەکانی نووسەردا (اند) نەکەوتۆتە ناوەندی ڕەگی وشەکانەوە . کاتێك ( اند ) دەتوانێ ناوگر بێت ، کە بکەوێتە ناوەندی ( سووت ، خنك ، جووڵ ، ڕووخ ... ) ەوە . بەو بۆچوونەی د. پاکیزە بێ دەبێ پاشگری ( گەر ) لە وشەی ( ئاسنگەری )دا ، ( باز ) لە ( فێڵبازی ) دا ، ( ستان ) لە (کوردستانی)دا، ( وولە ) لە ( مێشوولەکە ) دا ... یاخود پێشگری ( دا ) لە وشەی ( تێداچوون ) دا ، ( هەڵ ) لە ( لێ‌هەڵکێشان ) دا ... ناوگر بن ، ئەوە ئەو دەمە دەبێ جیاوازی پێشگرو ناوگر ، یاخود پاشگرو ناوگر چی بێ؟ وەڵامی ئەو پرسیارە بە لای شارەزای زانستی زمانەوە پێویستە شتێکی سەرەتایی بێ .

کێشەی ( ناوگر ) لای رووناکبیران زمانناسانی کورد وەك تارمایی وابوو ... هەندێك بێ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەو بیرکردنەوەو شوێن‌کەوتن‌و بەدواداگەڕان بڕیاریان دابوو کە ناوگر لە زمانی کوردیدا نی‌یە . تاکە تاکەیەکیش بە هەڵە هەندێ زیادیان بە ناوگر لە قەڵەم دەدا .

د. پاکیزە سەرەڕای ئەوەی پاشگری ناوبراوی لێ بووە بە ناوگر ، ( اند ) یش بە ( ند ) تێ‌گەیشتووە . جێگەی سەرسوڕمانە کە نووسەر لەو دەستوورە سەرەتایە ئاگادار نی‌یە ، کە بزوێن بەدوای بزوێندا نایەت . کاتێ پاشگری ( اند ) بە دوای کرداری ( سووتا ، خنکا ، ڕووخا ... » دا بێت ، یەکێ لەو دوو بزوێنە ـ واتە بزوێنی سەرەتای پاشگری (اند)و بزوێنی کۆتایی کردارەکان ( سوتا ، خنکا ، ڕووخا ... ) ـ تێ‌دەچێ‌و یەکێکیان دەمێنێتەوە ...

**بەڵێ منیش لەو ڕایەدام کە بەشێك لەو وتارانەی لە گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوەو د. نەبەز ڕەخنەی لێیان هەیە ، ڕەخنەی قووڕس هەڵدەگرن ، بەلام سەیر ئەوەیە هەندێ وتاری دی لە هەمان گۆڤاری کۆڕدا بلاکراونەتەوە ، کە ڕەخنەی قووڕستر هەڵدەگرن‌و کەچی د. نەبەز ئەوانەی نەکردۆتە نموونە ، چونکە وەك ئاگادارم لەگەڵ خاوەنی هەندێ لەو وتارانەدا دۆستایەتی‌ی هەیە ! .**

دیسان من لەگەڵ ڕای د. نەبەزم کە دەڵێ : « کۆڕ دەچێ نامیلکەیەکی وەك ( ڕێکەوت لە تەرازووی ژیری‌دا ) بڵاودەکاتەوە » ( ل ٨٥ ) . لێرەدا کە ڕام لەگەڵ د. نەبەزدا یەك دەگرێتەوە ، وەنەبێ لەوە بێ‌ئاگا بم کە لە یاسای ناوخۆی کۆڕدا بەندێك هەیە بووژاندنەوەی ژیاری ئیسلامی (٨٤)و بەپێی پەیڕەوی کردنی ئەو بەندەش ( لیژنەی ژیاری ئیسلامی ) (٨٥) سازکراوە ... بە ڕای من ئەمە هەموو کولتووری ئیسلامی ناگرێتەوە ، بەڵکو تەنیا ئەو بەشەی دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە کوردەوە هەیە . جا نامیلکەی « ڕێکەوت لە تەرازووی ژیری‌دا » ، نەك هیچ پەیوەندی‌یەکی بە کوردەوە نی‌یە ، بەڵکو بەمە گشتیش چەند شتێکی ئێجگار سادەو ساکارە کە نووسەرەکەی لە هەندێ کتێبی عەرەبی‌یەوە وەری گرتووە . لەبەرئەوە لە هەموو حاڵەتێکدا کۆڕ نەدەبوو لەچاپدانی ئەو کارە بگرێتە ئەستۆی خۆی .

**لەکاتێکدا لۆمەی کۆڕ دەکەم کە نامیلکەی « ڕێکەوت لە تەرازووی ژیری‌دا » چاپ‌کردووە ، هەروەها گلەیی لەوانەش دەکەم ئەو هەڵەیەی کۆڕیان زل کردووەو بە جۆرێکی تر لێکیان داوەتەوە.**

لەگەڵ ئەوەش‌دا نە د. نەبەز نە کەسی‌دی باسی

کتێبی « ڕۆڵە پەروەری لە ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا »ی (٨٨) نەکردووە کە کۆڕ یارمەتی لەچاپدانی داوە ، کە من چەند جارێك لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کۆڕدا ڕەخنەم لەو کارەیان گرتووەو ئێستاش وا بە نووسین ناڕەزایی خۆم نیشان دەدەم . لە دەربڕینی ئەو ناڕەزاییەمدا دەڵێم : بەرهەمێك بە شیعری لەنگو سەقەت باسی چەند بەشێکی باوەڕی ئیسلامەتی بکا ، چۆن کۆڕ بە کاری بووژاندنەوەی ژیاری ئیسلامەتی دادەنێو یارمەتی لەچاپدانی دەدا بۆ سەلماندنی ئەو وشانەم داوا لە خوێنەری بەڕێز ئەکەم بگەڕێنەوە کتێبەکەی ناوبراو .

بەڕاستی لەمەو هەندێ کاری دیکەدا کۆڕ جێگەی ڕەخنەیە . بەڵام لەکاتێکدا کە ئەم ڕەخنەیە لە کۆڕ دەگرم ، ئەوەش لە یاد ناکەم کە کاری بێبایەخ یاخود کەمبایەخی کۆڕ لەچاو کاری شاکارو زانستیدا ئێجگار کەمن . ئەو هەموو بەرهەمە شاکارانەی لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا پێشکەشی کردوون ، جێگەی شایانو پرشانازییان لە ژیانیزانستیو ڕووناکبیری کورددا وەرگرتووە . هەروەها با ئەوەش لە یاد نەکەین کە کۆڕ کەمتەرخەمی نەکردووە .

لەگەڵ ئەوەشدا کە وتارەکەی د. نەبەز لە جەوهەری ڕەخنەو زانستو ڕاستیو دلسۆزی دوورە ، بەڵام من هەر سوپاسی دەکەم ، چونکە هەلی بۆرە خساندم کەتارمایی دەوری کۆڕ برەوێنمەوە .

لەکۆتاییدا داوا لە هەموو دلسۆزێکی کوردو هەموو ڕاستی پەروەرێك دەکەم ، گلەییم لێ نەکەن ناوناوە وشەی توند کەوتۆتە نووسینەکەمەوە . من لە تێکڕای نووسینەکانمدا نەك هەر وشەیەکی توند چییە بە هیچ کەسم نەوتووە ، بەلکو خۆیانماندو کردووە . سوپاس بۆ هەموو دلسۆزانو گلەییش لەوانەی ڕاستی دەشێوێنن .

**پەراوێزەکان :**

(٦٦) بڕوانە : لەبارەی لیستەی یەکەمی ( زاراوی کارگێڕی ) یەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٨٨٨ .

(٦٧) شێخ محەمەدی خاڵ ، سەید جەمالودینی ئەفغانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ١٩٧٥، ، ل ١٥٨ ــ ٢٠٦ ، بەرگی چوارەم ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨ ــ ٤٩ .

(٦٨) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لەکوێوە دەست بکەین بە دەستوورسازی ڕێزمانی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ل ١٨٠ ــ ٢١١ ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٣٢٤ ــ ٣٦٢ .

(٦٩)
**S. N. Sokolov , The Avestan language, Moscow, 1967.**

(٧٠) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، بەزمی ڕێزمانو زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦١ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥ ــ ٩ .

(٧١) هەمان سەرچاوە ، ل ٧

(٧٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٧

(٧٣) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، بووژاندنەوەی زمان « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٤٣ ــ ١٩٧ .

(٧٤) هەمان سەرچاوە ، ١٦٤ ــ ١٦٥ .

(٧٥) بڕوانە : مەسعوود محەمەد،چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧٧ ــ ٨٥.

(٧٦) بە وێنە بڕوانە :

أ ــ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥٧ ــ ٥٨ ، ٦٢ ــ ٦٣ .

ب ــ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ ل ١٤.

(٧٧) سەرچاوەی ناوبراو ، بەزمی ڕێزمانو زمانی کوردی ، ل ٧ .

(٧٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٨

(٧٩) هەمان سەرچاوە ، ل ٩

(٨٠) هەمان سەرچاوە ، ل ٩

(٨١) هەمان سەرچاوە ، ل ٩

(٨٢) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٩٨ ــ ٤٩٦ ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١ ــ ٣٥٨ ، ژ٤، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٨٩ ــ ٤٠٠ ... هەروەها کتێبی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٨٣) دوو ساڵ لەمەوبەر دەربارەی بەرهەمی

بلاوکراوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی وتاریکم بۆ گۆڤاری کۆڕ نووسیەو بلاویان نەکردەوە ... لەو کتێبەمدا کە بە ناوی ( ڕێزمانی کوردی ) بەوەیەو ئێستا لەژێرچاپدایە ، بەشێکی سەرنجو ڕەخنەکانی وتاری ناوبراوم تۆمارکردووە .

(٨٤) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧٤٢ .

(٨٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٢٩ .

(٨٦) د. مارف خەزنەدار ، زۆری لە ناوەرۆك بەدەرە لە شاعیر دەدوێ ، « هەڵبژاردە لە دیوانی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان » ، بەغدا ١٩٧٧ ، ل ٧٧ – ٨٢ .

(٨٧) هەمان سەرچاوە ، ل ٨١ .

(٨٨) محەمەد بالیسانی ، ڕۆڵە پەروەری لە باسی ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا ، بەغدا ، ١٩٧٧

(٨٩) هەمان سەرچاوە ، ٣٢ – ٣٣ .

(٩٠) مەرجەکانی بارمەتیدانی کتێبدانانو وەرگێرانو لێکۆڵینەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٥٢٨ .



[ لەناو شانەی شیعرەکانما
هەنگوینێکی سپی وەها ئەپرژێنن
ڕوناکترە لە ئاوێنەی ئاسمان
ئەستێرە شایی تیا ئەکاو فرمێسك ئەیکا بە چراخان ]

( لە ناحیەی عەربەتی تریك سلێمانی لە ئەمووزی ١٩٤٨دا لە خێزانێکی ئایینی لە دایك‌بووم، جیهانی منالیم جیهانێکی جوان بوو ، پڕبوو لە خۆشی‌و خەم‌و هەست‌کردنی سەیر ، لە بیری سۆفیانەی باوکمەوە پاکی‌و بێ تاوانی فێر بووم، وە لە هەلوێستی کۆمەلایەتیشەوە خۆشەویستی ولات‌و خۆشەویستی هەژارەکان‌و وەستان لەبەرەی زۆر لێکراوانـدا فێربووم ) (١) . لەپاش ئەمە انور باس سەردەمی منداڵی خۆی‌و چۆنیەتی مەزاج‌و هەلکەوتنی سایکۆلۆژی‌ی خۆی ئەکات . جیاوازیەك نیشان ئەدات لە نێوان ژیان لە عەربەت‌و ژیان لە سلێمانیدا بە مانا ناوچەیی‌و بچووکەکە ، بەلام ئەمە لە پەنجەرەیەکی ترەوە تەماشای ئەکرێ حسابێکی‌ووردتر لەو حەزکردنەی ئەوی بۆ ئەکری . وەك خۆی ووتی سەرەتای پەروەردەبوون‌و شارەزایی یەکەمی لە ژیان لە خێزانێکی ئایینی‌یەوە دەست پێ‌ئەکات‌و تێکەل بە لێکدانەوەیەکی ڕۆمانتیکی ئەبێت ـ واتە تەماشا کردنی ژیان بە چاوی ( سۆفییەکی ڕۆمانتیکییەوە ) ئەمە هیچ سەیر نی‌یە چونکە ئەگەر لە هیچ ڕوویەکی ترەوە جیهانی سوفی‌گەری لەگەل ڕۆمانتیکیەتدا یەك نەگرێتەوە ئەوا لە شیعردا ئەبن بە یەك‌و چەندەها وێنەی جوان‌و پەلکەزێرینە ئەنەخشێنن.. تیشکە ووردەکان نزیك‌ئەبنەوەو لەگەل خۆیاندا فەیزو نووری خوا ئەرژێننە دلەوە . لە جوانی‌ی ڕووی ئازیزو کالآی ڕەنگین‌و شاگولی باخە سەوزەکانی دنیاوە کلاوەی ڕەحمەت‌و خۆ بە دەستەوەدانی سۆفیانە ئەبێت بە چۆلەکەیەکی نوورانی‌و فرەفر بە دەوری ڕۆخی ئەو عاشقە بێ پەروایەدا ئەکەوێتە هەلفرو دافر : ـ

[ ئەو دلەی وێنەی پەرەی گوڵ بێ گەرد
هەی خەم هەی نامرد چەنێت مەلول کەرد
ئەوسا ئیستیفناو فین وهەم ماومرد
ئینسان بێ پەروا گیان تەسلیم مەکەرد
ئیسە بۆ ئەی تاو هەرس چون سەیلە
ئەی ئیلتیفاتەو ئەی وەفاو مەیلە
ئەی دلەی نازك خەستەی خەمانە
گۆشت دەرو بزنەو ئەمجا بمانە ] (٢) .

بۆیە سەرەتا نموونە بە ( مەولەوی ) هێنابەوە چونکی ئەو یەکەگیرییەی لە نێوان هەندێك بابەتی شیعری انور و کێشەی سوفی‌گەری بەرچاو ئەکەوێت ـ هەر لە ڕۆژەکانی هەلچوونی‌ی گیانی‌ی ئەوو سەراپای ژیانی شاعیریەتی‌ی ئەو . ئەگەرچی من لای خۆمەوە هەر لەم نووسینەدا ڕوونی ئەکەمەوە کە هەست‌و سۆفیزمانە لە شیعری انوردا تەنیا تالە تیشکێکی باریك‌و تیژڕەوە لە ساتە شیعریەکانیدا خۆیان لە تەمامی سەوزی تازە هەلچووی واتا شیعریەکانی ئەپێچن‌و هێندە نابات ئەو گرژی‌و توند




خۆئالاندنەیان خاوئەبێتەوەو تیشکەکە وون‌ئەبێتەوە . هەر بە پێی لێکۆلینەوەکە ئەوە ئەسەلمێنن کە دیاری کردنی هێلی ڕێبازی سۆفیزمی تەنیا لە بەرەی خەیال‌و باری واقیعە تالەکانی ناو شیعری شاعیردا ئەوەستن‌و هەر هەموویان لەسەر زەمینەیەکی ڕۆمانتیکی وەستاون‌و ڕێچکەیان بەستووە . خوێنەریش لەوە ئاگادار ئەکەمەوە کە ناونیشانی باسەکەی من لە وون‌بوون‌و ئینجا دۆزینەوەدا نی‌یە یاخود دۆزینەوە ئینجا وون‌بوون .
چونکە هەندێك دیاردەو ناوەرۆکی ژیان هەیە

ناتوانرێت بە هێڵێکی زەق لە نێوان لەشیاندا کەرتو پارچە جوێبکرێتەوە . یەکێک لەو دیاردەو ناوەرۆکانەی ژیانیش کە بە تەعبیر لێ‌کردنێکی ویژدانیو بیرێکی تایبەتی دێتەدی بریتی‌یە لە شیعر . ئەمەش بە هەر حاڵ ـ بەڵام کام شیعر ! شیعر بە واتا پڕ بەپڕی شیعر یاخود شتی تر ـ چونکە شیعر هەیەو شتی تریش هەیە زۆر جار ناوی شیعری لێ ئەنێن .

بۆ نزیك‌کردنەوەی مەبەستەکەمان کە باس لە شیعری انور ئەکرێت ، ئەبێت بووترێت خوێنەری تایبەتی شیعری انور چونکە لەوەدا کە شیعری باش

# دۆزینەوە لە (زریان)دا

لە دەست هەموو کەس نایەت ، تێگەیشتنیشی وەك پێویست کاری هەموو خوێنەرێك نی‌یە .

ئینجا ونبوونو دۆزینەوەکە لای من یەکن ـ جوێ نین ـ ئەویش مانای زانستی‌ی خۆی لە گەردووندا ئەبەخشێت ـ چونکە ونبوونی هیچ شتێك مانای نەمانی نی‌یە بەڵکو گۆڕینیەتی لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر . هەروەها دۆزینەوەیش مانای خەڵقکردن نی‌یە بەڵکو بارێکی نوێو ئەنجامی ڕێکەوت یاخود تێکۆشانێکی بەردەوامە . لێرەدا ئەو شتانەی لای انور ون ئەبن مانای لەناو چوونیان نی‌یە‌ـئەشێت لەهەر ساتێکی تێپەڕینی شیعریی ئەودا چەند ونبوونو دۆزینەوە ڕوویدات . دژوارییەکان خەستئەبنەوەو تەمەکان چڕئەبن ، زریانیش گەلێك

ڕواڵەتو ناوەڕۆك بەسەریەکدا ئەشێوێنێتو کەلێکی تریش ڕێك ئەخاتەوەو بۆ هەنگاوی پاش نوێ‌کردنەوەکە ئامادەی ئەکات. هەیە هەر زوو ئەبێت‌بە شاعیر ! نەك بە دیوانێك و دوان بگرە بە شیعرێك ، بەدوو شیعر ! . هی واش هەیە هەتا ئەمرێت هەر بە شاعیر نابێت ـ گۆران ـ تەنیا جوانی بێ ناوو زیندانی ئەزدەهاكو شەهیدی بووتایە ئەگەریش نەبووایەتە ئەم ـ گۆران ـ ەی ئێستا هەر ئەبووە شاعیرو جێگەی خۆی لە شیعری کوردی‌دا ئەگرت .

لەو کاتەوە بەتایبەتی هەر لە سەرەتای هەفتاوە شیعر وەك لێزمەی بارانێکی بەهاری شەستەو ڕەهێڵەی بەسەر خاکی لە نوێ ژیاوەی ولاتدا بەرپانەکرد . گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان بە تایبەتی ـ هاوکاری ـ ببووە مینبەرێکی ئەو بە خۆداهاتنو لێشاوە ئەدەبی‌یە . وەك دیاریشە شیعر لە ڕیزەکانی پێشەوەدا بو . ئەم شەپۆلە ئەنجام لە کەنارێکدا ئارام بووەوە . بە جۆرێك توانرا شیعری باشو خراپ لەو مەیدانی گوڕهاتنە پێشەوەیەدا جوێبکرێتەوە هەندێك هەبوون پێشتر شیعریان خۆی فەرزکردبوو . هەر بە ڕاستیش شاعیر بوونو لەو تەقینەوەیەشدا هەر بە شاعیری مانەوەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ـ شیعر لە دوای شیعر قووڵ ئەبوونەوەو بە ناخی دەروونی ڕەسەنیەتیو تەکنیکی هاوچەرخانەدا ڕۆئەچوونو شتی باشیان پێشکەش بەو خەڵکەو بە ئەدەبی کوردی ئەکرد . لەوانە ـ حەمە صالح دیلانو کامەران موکریو ع.ح. بو شێرکۆ بێ کەسو جەمال شاربازێڕیو عبداللە پەشێو.بەڵام لەپاشدا هەندێکیان نەیانتوانی هاوشانی پێشەوەچوونی تەکنیکی نوێو باری واقیعی شیعرو ژیانی واقیعی‌ی میللەتەکە ڕێکە بگرنەبەر . بۆیە وەستانو اە جێگەی خۆیان کەوتنە ـ ڕاوح ـ کردنو ئەوەش کە ئەیان نووسی بە هیچ جۆرێك تێپەڕینێکی تێدا نەبوو ، چ لە شیعری خۆیانو شاعیرییەتیان ، چ لە ناوچەییو عالەمیەتی شیعردا . کەچی هەندێکی کەیان وەك شێرکۆو جەمالو عبداللە پەشێو ـ بەردەوامییان مۆگەر کردو لە تاقی‌کردنەوەکانی خۆیانو ئەدەبی گەلانی کەوە دینایەکی نوێی شیعری کوردی‌یان دروست کرد .

ئەنجا لەو گەرمەی بە خۆدا هاتنەوە شیعرییەی باش هەفتاوە انور یەکێك بوو لەو شاعیرانە ، ساڵی ١٩٧٢ بەساڵی ـ بەرهەم بڵاوکردنەوەو ناسینی انور دا ئەنرێت . هەر لەشیعری ـ پشکۆکانی ناخمەوە ـ

هەتا ئەگاتە ـ بمدمرە دەس سەرماو سۆڵە ـ زیاتر ڕەوتی بەرەو پێشەوەچوونو دیاریکردنی دەنگی تایبەتی بۆ شاعیر مسۆگەر ئەکەن .

لەوێوە ئەتوانین پەنجە لەسەر لایەنە سەرکەوتووەکانی شیعرەکانی دانێینو بڵێین ـ ئەم شیعرەی لەو دیاردەیەدا بریتییە لە تێپەڕین ـ و لەو لایەنەشەوە زیرەکانە کێشەکانی بە پێی مۆسیقایەکی هێمن یان تووڕە دابەش کراوە ـ یاخود فلان تەکنیکی شیعریو ڕەمزو قناع ـ بەموڵکی خۆیو لێ هاتوویی سەلیقەی شیعریی خۆی دا نە نرێت. دنیای شیعری انور بەوە دێتە پێش چاوم کە لە دوورەوە تەمێکی ڕەنگاوڕەنگ دەرئەکەوێتو ووردە ووردە نزیك ئەبێتەوە، لەگەڵ نزیك بوونەوەکەشیدا خەستو چڕ ئەبێتەوە منیش لە بەرانبەری پێ دەشتێکی بەریندا وەستابم . کات بەرەیەیان بێتو تەمە خەستەکە ڕەنگیکی سپیی شیریی بگرێتە خۆو بە سەراپای دەشتەکەو پەخش بێت ، ناو بەناو لە هەندێك جێکەدا تەمە هەرە سپییەکە تەنك ئەبێتەوەو هێندەی ئەو دەلاقەیە دەشتەکەم لێوە دەرکەوێت . ببینم لەو ئاستەدا بزووتنو جوولەیەك هەیە ـ گرنگ ئەوەیە هەموو شتێکی جوولەو بزواندنە کە ئەبینم تەنیا هەست بکەم هەیە . ئەم حاڵەتو بینینەش ئەگەر لە بەکەم شیعریەوە نەیەتە دی ئەوا ئەتوانین بڵێین شیعری ـ زیندە خەوو تارماییەکان ـ بریتییە لەسەرەتاکەی

**[ هێندە ڕوانیم هێندە ڕوانیم**
**هەموو جیهان لەناو چاوما ئەخولێتەوە**
**بوونم تۆپەڵە بەفرێکە**
**لەناو لەپی گریوەدا**
**هەموو ڕۆژێ بەسەدان جار**
**ئەیبە ستێتو ئەتوێتەوە ]**

ئەم هەڵچوونو داچوونە ئەبنە پێشەکیی دۆزینەوەو ونبوون ، ئینجا دۆزینەوە ـ کەچی پێش ئەم شیعرە لای انور شیعر نابێتە کشانی ئیشکە ڕۆحیو باڵندە سپیو نوورانییەکانی فریشتەکان .

خاك تێکەڵ بە خۆشەویستی ئەبێتو شتە گشتیو کەرەسە تەقلیدییەکانی ئەو شەپۆل شیعرییەو کاری دنیا شیعرییەکەی دەورو پشتی لە میشدا دەرئەکەوێت . ئەو شیعرەی چەند ڕستەیەکم لە سەرەوە بە نموونە هێنایەوە ئەوەندە جیاوازە لەگەڵ شیعری ـ پشکۆکانی ناخم ـو لە جانتای پۆستەرێکی شاری گریانا ـ و گیانەلاوی گەشتێکدا ـ کە ئەشێت بڵێین هەتا ئەوێ دەنگی انور. خەڵکی ترو شتە عادەتیو باوەکانی تریش بوون . بەڵام لەو شیعرەوە ـ زیندە خەو ـ ئەگەر سنوور بنێت ئەوا شاعیر بەدوای دەنگی خۆیدا ئەگەڕێتو لەوونبوونو دۆزینەوەکاندا مامەڵە لەگەڵ شیعری ڕەسەنی دەست سەلیقەو وەستایەتی شاعیرانەی خۆی ئەکات .

لە ـ پشکۆکانی ناخم ـ دا وەك ووتم شتی ( عادەتی مەئلووف ) و دەنگی باوو خەڵکی تریش تێکەڵ دەبن ـ ئەویش لەگەڵ ( باو ) ەکاندا ئەڵێت :ـ

**« کزەبای کێوی ژانی تاڵ**
**گەڵای زەردی وەریوی گیان**
**ئەوەروژێنێ**
**تەمی چاوی هۆنداوەکان**
**پرشنگی سوور ئەتاسێنێ »**

بەم جۆرە قافیەکان دێنە خوارەوە [ئەوروژێنێ، ئەتاسێنێ ، ئەمرێنێ ، ئەبارێنێ ، ئەبچرێنێ ] ، شیعری ـ لە جانتای پۆستەرێکی شاری گریاندا ـ و ـ گیانەلاوی گەشتێکدا ـ هەمان دووبارە بوونەوەی تیدایە [ هێلانەمە ، هەناسەمە ، هەوارمە ، مەرامە، ئەسوتێنم ، ئەخولقێنم ] ، [ شەیدایەکم ، لاوێکم ، گریانە ، بارانە ، بتارێنێ ، بشلەقێنێ ، ئەتوێتەوە ، ئەکوژێتەوە ، ئەپژێنێ ، ئەنەخشێنێ ] ئەمە وەك عادەتو تەقلیدی بەکارهێنانی قافیەو هێشتا شارەزا نەبوونی لەبەکارهێنانی مۆسیقاو ئیقاعی ناوەوەی شیعر ـ هی ووشەکان ـ لەو شیعرانەدا ئەتوانین بڵێین :ـ کزەبا گەڵا ناوروژێنێ بەڵکوو ڕەشەبا گەڵا ئەوەرێنێ بەڵکوو سروشتی ئاسایی پایزو گۆڕانی دۆخی وەرزەکە ئەمە ئەکات .

نازانم مەبەست لەم واتایانە چییە [ پشکۆی چاوەکانم ئەمەیون ، بەرەو وڵاتی ئەبونتان هەنگاو ئەنێم ، لە خەوو خەیاڵی مردووم ، گیانو بونم ئەخولقێنم ، باوەشی چلکنی شار ، جەرگی جەستەی ئاوەڕوانی ، بەفری تینو ، چاوی مەیوی ئاسمان چاوی هۆنراوەکان ، کزەبای کێوی ژانی تاڵ ، دڕکی خەم ، کفنی گۆڕستانی تاری ناو دڵم ، چاوی مردن تێر خەو ئەکەم ، دەنووکی واشەی ژانی تاڵ ، شەو ئەمری ، ] ئەم واتایانە سەردەمێکی زۆر لەشیعری کوردیی ئەو کاتە ببووەباو ، گەلێك جار شاعیر خۆی بە دەلالەتی جیاو مەبەستی ناوەوەی خۆی ئەمەی ئەکرد .

نەشێت هەندێکیان هەر بەراست وەك چـاو بەستێك وەۆدەی شیعر ئەو

واتایانەیان دانابێت ـ خۆشیان نەیان زانیبێت چی تەبەخشیت و ، لەپیناوی کام مەبەستا بەکاریان هێناوە.بۆیە ئیمە لەبەرانبەر ئەم کێشەیەدا بە گومانەوە هێناوە . بۆیە لەبەرانبەر ئەم کێشەیەدا بە گومانەوە ئەوەستین . ئەو جۆرە مۆدەیەش لە سەرەتاوە تۆوی مەرگی خۆی هەلگرتبوو . گەروەهـا نەبووایـە وا بەزوویی نە ئەبووە هەلمو لەچاو وون نە ئەبـوو . هەروەها وەك هەمان دەستووری زۆربەی شیعرەکان بە ووشەی خۆشەویستم دەستی پێ ئەکرد . انوریش ئەو دەستوورەی ڕەچاو کردووەو لێی تەرك نەبووەن

**[ خۆشەویستم**
**دلمان هەر چوار وەرزەکەی زستانە ]**
**[ خۆشەویستم**
**کاسەی سووری چاوانی من ... ]**
**[ خۆشەویستم**
**زۆر دەمێکە دەنووکی واشەی ژانی تاڵ ]**
**[ خۆشەویستم**
**کاتێ لێوی بەفری سلپی شەیدا لە دوور .. ]**

لە کۆتایی شیعری [ هەموو دلداری بەیـانو نانین ] دا شاعیر بە پەراوێزی ڕوونکردنەوەیەك لـە بارەی شیعرەکەیەوە ئەنووسێت [ هەولێکە بـۆ بەکارهێنانی دوو جۆرە کێشی تازە لە شیعری نوێدا] ئەم بڕیـارە پێویستی بـە لێووردبـوونەوەو شیکردنەوەیەکی باشهەیـە . شاعـیر ئەلێت : ـ **هەولێکە ـ واتە هێشتا هـەر هـەولەو لـە تاقیکردنەوەدایە بەلام دەبووا لەپاش هەولی ئـەو شیعرەوە زیاتر هەولەکە چەسپ بووایەو کێشەکە لە تاقیکردنەوە تێپەڕیایـە . دیارە لـە ڕێچکـەی شیعرەکانیدا ئەم شیعرە شازەو لەوانی کەدا هیـچ هەولێك بۆ دۆزینەوەو بەکارهێنانی هیچ کێشـێك نەدراوە .**

ئەگەر بەم پێیە بوایە پێویست بوو شـیعری ( بەدەرە دەس سەرماو سۆڵەو سۆناتەی تینویەتیو وەرە خوارێ ئەی خواکەی غەریبان ) یش زیاتـر پەراوێزی بۆ دروست بکرایەوە بڕیاری لەو جۆرەی بەسەردا بدرایە .

تەنانەت وەك تەکنیكو گوڕو هێزی شیعریش ئـەو شیعرە ـ هەموو دلداری بەیانو نانین ـ ناگاتە ئەو سێ شیعرەی ناوم هێنان . جگە لە دابەش کردنی مۆسیقاکەیو گرنگیو گوێدان بە قافیەی ناوەوەی ووشـەکان . لە ڕووی سالی نووسینی شیعرەکەشەوە تەماشای بکەین ئەم ١٩٧٣ یـەو ئەوانیش ١٩٧٥ ، ١٩٧٦ ، ١٩٧٧ ئەبن بە سالی نووسینیان واتە ئـەو چەند سالەی ئەکەوێتە ئەونێوانەوە هیـچ پێشەوە پێشـەوە چوونو خەست بوونەوەو تاقیکردنەوەیەکی کەی تیادا نەبووە ؟ ! .

بەشی یەکەمی شیعرەکە بە واتایەکی چـوار بڕگەیی دەست پێ ئەکات :

ئاسمان ماتە ـ لە دێری سێیەمدا بەرانبەری هەر چوار بڕگە دەست پێ ئەکاتەوە . سەگوەڕ گەرمە ـ لە دێری یەکەم و دووەمو سێیەمدا کێشی (١٤) بڕگە بەکار هاتووە . ٧+٧=١٤ ، دێری چوارەم کێشی حەوت بڕکە دووبارە ئـەبێتەوە . جگە لـە ئوسلووبی تەقلیدیی ـ جووت قافیە ـ وەك ـ وون بوونن ، دەروونن ، هەتا دەگاتە نایهەژێنێ ، ئەیپرژێنێ، لەبەشی دوومی شیعرەکە شدا هەردوو دێری ـ ( لە جێگای ساردو ڕچیوما نوقمی دەریای دڕکەزیم ـ و ـ جێگای ساردو ڕچیوما بەندەرێ هەیە ببینم ) کێشی هەشت بڕگەیین بە هەر دوو ئەبن بە ٨+٨=١٦ واتە هەر دوو کێشـەکە ١٤ بڕگەییو ١٦ بڕگەیینو لە زۆر شیعری کوردیدا بەکارهاتووە .

بەلام سـەرەڕای ئەم ڕووە کلاسیکیو دووبـارە بوونەوەی دەنگە شیعریانەی تێکەڵ بە کەسانی تریش ئەبن ، شاعیر توانیویەتی لە لایەکی کـەوە خـۆی بگرێتەوەو لەم کۆسپە دەربازبێتو بە هەولێکـی شاعیرانەو گەشبینییەکی مرۆڤانەوە وەك کوردێکـی خاوەن باوەڕو وڕەی بەرز لـەژیـانو دوا ڕۆژی میللەتەکەی ئەڕوانێت ـ زۆر لەو شەپۆلە ڕەشبینیو بێزلێکەرەوەو کەم ئەفەسانەی بەسەر دەنگەکانی کەدا ئەهاتن زۆر بە دەگمەن ئەم ئەگرێتەو ـ ئەو کاتەش دژواریەکانی ڕووی کۆمەلایەتیو گردبوونەوەی لـە کێشـەی نەتەوایەتیدا بە جۆرێك بوو کە مرۆڤ ئەگەر ئاگاداری خۆی نەبوایەو بە چاوێکی گەشو بیرێکـی زانیستیانەوە تەماشای گۆڕانکاریەکانی نەتەوەکەی نەکردایە بێگومان تووشی ڕەشبینیو خـۆ لـە دەستچوون ئەبوو ـ نموونەی ئـەو ڕووناکیـە تەنانەت لەو چەند پارچە شیعرە سەرەتایەشـدا دەرئەکەون :

**[ لەجێی خوڕەی ڕووبارێکی شینو هێمن**
**شەپۆلی دەریایەکی شێتو شەیدا بێنێ »**

**« وەکو هیوام ، شەوی ژانو نا ئومێدیم**
**ئەسوونێنم »**
**« من پەیامی خۆشەویستیم »**
**« وێنەی من بە خامەی قولنگ کێشراوە**
**ڕوبارێکە ئەڕژێتە دەشتی تینوێەتی دنیاوە »**
**« فەرهاد زووکە**
**تەمی خەستی گلێنەمان بڕەوێنە**
**قولنگەکەت بوەشێنە**
**تاوێری بێستون برمێنە »**

( حەمدی ) دەلێت : ـ

**« سوبح پێ ناکەنێ تابی نەوایێ شەو بە دڵ نەگری**
**گولێ ناپشکوێ تا بلبلی سوبحی بەکوڵ نەگری**
**بەری نابێ درەختی‌باخی‌عا لەم هەتا هەموو وەك یەك**
**بە یەك سۆزو بە یەك شۆڕو بە یەك دەم چڵ بەچڵ**
**نەگری » (٣)**

لە حەمدیش نزیکتر بڕوانین ( گۆران ) لـــە هەموان بە سەلیقەو وەستایانە تر بۆ بەکارهێنانی گریان چووە . لە ـ هەوری پایز ـ دا ئـــەمـــەی ( گۆران ) و ئەوی حەمدی‌و ئەوی انور هەرسێکیان یەك ئەگرنەوەو یەك مەبەستیان هەیە لە ڕوو کردنـــە بەکارهێنانی گریان وەك ئەنجامی ئازارێکی سەخت‌و دەربڕینی قین‌و ئەو نیازە خاوێنانەی لە دەروونـــی مرۆڤـدا پەنگیان خواردووەتەوەو تاساون .

**« بەسەر پایزی زەردا با بە خوڕ بگری بە کوڵ بگری**
**لەسەر ائخر گەڵا ئاخر چڵی تەنیایی گوڵ بگری**
**بە خوڕ بگری بە کوڵ بگری بەسەر دەشـــتو دەری**
**وشکا**
**بە سەر داری گەڵازەردا ، بەسەر پوشا بە سەر دڕکا »**

هەتا ئەڵێت : ـ

**« بەلێ بگری هەور بارانی پایز بێ وچان بگری**
**لەسەر باخچەی گولێ وا سیس ئەبێ ائخر چڵـــی**
**عومری » (٤)**

هاوکێشـەکان لەهەر سێ نموونەدا بەم جۆرەن‌ـ [ سوبح پێ ناکەنێ ـ گوڵ ناپشکوێ ـ بەری نابـــێ درەختی باخی عالەم ـ **هەتا** ـ بێ نەوایەك‌و بولبولێك‌و ئەوانـــی تریش هەموو وەك یەك نـــەگرین . ] لای ( گۆران ) یش (بەسەر پایزی زەردا ـ بەسەر دەشت‌و دەری وشکا ـ بەسەر داری گەڵازەردا ـ بەســـەر پووشا ، بەسەر دڕکا .. هتد هەوری پایز با بە خوڕ بەکوڵ بەسەر هەمووانەو زۆری کەشدا بگری‌گریان‌لای گۆران ئەوەیە هاوین ووشکایی تەواوی خستووەتـە

سروشتەوە . سروشت کـــە ڕەمزی زینـــدوێتی‌و جوانی‌یە تینووەو چاوەڕێی بارانێکە ـ هەوری پایـز نموونەی خێرە لەباراندا دا ئەکات . ژیان‌و بووژانەوە سەر لە نۆی بە سروشت ئە بەخشێتەوە ، ( حەمدی ) یان ( گۆران ) ی لە سەرە ، تەنانەت زۆر جـــار هەندێك شت لە ـ لاشەور ـ دا دێنە پێشەوەو ڕوو ئەدەن یاخود گەرمی‌و گێژەنی خودە شیعری‌و ساتـە گەرمەکانی هێندە کەم دەرفەت‌و کاریگەرن ، مـــاوە نادەن بە شاعیر هەندێك لەسەریـــان بووەستێت‌و بەکاڵایان بکاتەوە . هەر ئەمەشە بووە هۆی بەسەردا تێ‌پەڕینی انور بەســـەر ئەنسیری ( حەمـــدی ) و ( گۆران )دا . سەرەڕای ئەمەش هـــەر ئەبووایـــە خونەری ئاگادار بکردایەوە لەپاش پێداچوونـــەوەی شیعرەکەی . شاعیر گریانەکەی بۆ لە دایك بوونێکی وەها ئەوێت کە بتوانێت بەرەنگاڕییەکی ئائزایانەی ئەو هەموو دژواری‌و شتە هودەیی‌و ڕەش‌بینی‌و تێ‌شکانی شاعیر لە هەندێك شیعریدا ئەم جۆرە هەڵوێستانەی لە وێنەی تری شیعرەکانیدا وەك ـ خاك‌و نریان ـ ە بەدی ئەکرێت توانیویەتی تیشکێك بهاوێتە ئـــەو تاریکیانەوە .

گەلێك جـــار فۆلکلـــۆر ئەبێتە مایـــەی دروست‌بوون‌و پەیدابوونـی گەلێـــك بەرهەمـــی هاوچەرخ‌و سەرکەوتوو ، ئەمەش پەیوەندی‌ی بـــە وێژدانی مێژوویی هەموو نەتەوەیەکەوە هەیـــەو ـ سیفات‌و خاسیەتـی ـ فۆلکلـــۆرو کەلەپـــووری نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەك تەعبیر لە هەڵکەوتنی باری مێژوویی‌و قۆناغی گۆڕانی ئەکات . لە سەرابـــای ڕۆژهەڵاتدا بەسەرهاتی عەشقی شیرین‌و فەرهاد لەناو هەر سێ نەتەوەی کوردو تورك‌و فارس‌دا دەنگـــی داوەتەوە . هەندێك جاریش بە شیرین‌و خەسرەو ناو ئەبرێت . شاعیرانی کۆنی ڕۆژهەڵات لە کۆنەوە ئـەو کارەساتە درامیەیان بە شیعر هۆنیوەتـــەوە . وەك ( فیردەوسی ) فارس‌و ( شەیخـــی ) عوسمانـــی‌و ( خانای قوبادی ) ی کورد . هەتا ئەگاتـە ( نـــازم حیکمەت ) ی شاعیرو پێشکەوتنخوازی ئەم چەرخە ، لای نازم حیکمەت پاڵەوانەکان ، کارەساتەکان جورێکی تر دروست‌ئەبنەوە . لای نازم حیکمەت فەرهاد تەنیا عاشقێکی سادەو ئەنانی‌و مولکی شیرین . نی‌یـــە ، فەرهاد کوڕی ڕەنج‌و تێکۆشانی میللەتێکە. کرێکارێکی وشیارەو ئەوەندەی هی شیرینە ، لەوە زیاتر مولکی خەڵکە برسی‌و چەو ساوەکەیە . [ نازم حیکمـــەت

بڕوای بەوە هەیە دراما تەنیا کارێکی هونەریی ڕووت نییە کە تەنیا دنیاو هەستو هۆشی خۆی بگرێتەوە. لەئو نووسەرە فێرکەرو دەرس دادەر نییە کە لە زۆر بابەتی شانۆیی کەدا ئەیبینین . هاوکێشەیەکی لە باری بابەتەکەی بەشێوەیەکی یەك لە دوای یەکی پێشکەوتوو هەتا کۆتاییەکەی داناوە ] (٥) .

لای انور – وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد – ئەبێتە وێنەیەکی هاوچەرخی شیرینو فەرهادی فۆلکلۆر بەڵام لێرەدا کۆمەڵێك حیواری یاخود دەنگی وەك یەکو مەبەستو دەنگێکی جیاوازو دژ بەوان ئەبیسترێت . سێ‌دەنگەکە کە نوێنەری هێزی خێرن کۆرسو شیرینو فەرهادە ، دەنگی بەرەنگاو بوونەوەکەش پیرەژنە . ئەگەر کاتی خۆی شاعیر هەر لەسەر ئەو مەیلە شیعرییە بیری لە نووسینی شانۆگەرییەکی شیعری بکردایەوەو هەمان بابەتی هەڵبژاردایە گەلێك ئەچووە پێشەوەو لایەکی ئەو بۆشاییە گەورەیەی پڕ ئەکردەوە کە هەتا ئێستا لە شانۆگەریی شیعری کوردیدا هەیە . بگرە لە چەند هەوڵێکی ( شێرکۆ بێ کەس ) زیاتر هیچمان لەبەر دەستدانییە . کەواتە داڕشتنەکەی انور زیاتر شیعرێکی درێژەو چوار دەنگ پێکی ئەهێنێنن ، شاعیر لە پەراوێزی دوا لاپەڕەی شیعرەکەدا دەربارەی ڕەمزەکات : [ تەنسیری شیرینو فەرهادەکەی نازم حیکمەتیشی تیادایە بەڵام لای خۆم چ ناوەرۆکو چ ڕوخسارەکەی جیاوازە – ئەم ڕەمزانەش وەك قناعێك لەتاقیکردنەوەیەکی تازەدا بەکارم هێناوە ](٦) . لە پێشدا ئەڵێم ڕەمز قناع نییەو ڕەمزیش هەر خۆی ڕەمزەو نابێتە قناع ، کەبووە ئەو ئەبێتە شتێکی ترو بارودۆخێکی تر لە بەکارهێنانیدا وەرئەگرێت . نازانم شاعیر مەبەستی لە تاقی کردنەوەیەکی تازە – چییە؟. لە بارەی ناوەڕۆکەوە باسی بکەین ئەبینین شاعیر هیچ خستنە سەریکی ( اضافە ) حەدیی – لە کارەکەیدا نەکردووە . هەروەها جگە لە پیرەژن کە وەك خۆی بە ڕەمزی بەڵاو دوو زمانیو شەڕ دایناوە ئیتر هەمان بابەتی ( نازم حیکمەت ) ی دووبارە کردووەتەوە .

فەرهادی کرێکاری نازم لە فەرهادی تێکۆشەری ئەنورە لە هیچ ڕوویەکەوە جوێ نابێتەوە . ئەگەر بمانەوێت خاڵەکانی جیاوازیی هەردوو دەقەکە نیشانەبکەین تەنیا ئەتوانین بڵێین : –

کارەکەی نازم شانۆگەرییەو ئەوەی ئەنوەر کۆمەڵێك ووتو وێژو ڕادەربڕینی چوار کەسە بە شیعر . بەتایبەتی هەردوو کۆپلەی کۆرس کە دووبارەی ئەکەنەوە تەواو لە قسەی ئەو پاڵەوانانە ئەچێت کە لە شانۆگەرییەکەی نازمدا فەرهاد هان ئەدەن بۆ کارکردنو ماندووبوونو کۆڵ نەدان . هێزی ئەنێنە بەرو هەموو هیواو دوا ڕۆژی خۆیان لە نووکی تۆلنگو بازووی فەرهاد – دائەبیننەوە .

[ ئافرەتە خاوەن منالەکە – منالەکەی بەرز ئەکاتەوە : – ڕۆڵەکەم گوێ بۆ دەنگی قولنگە کە ڕاگرە

خەلکەکە – بوەشێنە فەرهاد – قولنگەکەت بوەشێنە – تۆش ئەی ئاوی چیای ئاسن خێراکە وەرە دەرەوەو گۆزەکانمان پڕکە ، بوەشێنە ئەی فەرهاد – قولنگەکەت بوەشێنە . ] (٧) .

لە ( وەرزی سەر هەڵدانی فەرهاد ) دا بە هەمان شێوە خەلکەکەی نازم ئەبنە کۆرس لای ئەنوەر : –

**[ فەرهاد ، فەرهاد**
**قولنگەکەت بوەشێنە**
**لە دلی ڕەقی بێستونا**
**بۆ شارێکی برسیو تینو**
**ئاو دەربێنە – گوڵ برووێنە**
**فەرهاد ، فەرهاد ] .**

شیرین لە کارەکەی انورا وێنەیەکی نوێیە بەڵام پیرەژن هەر کەسە فۆلکلۆرییەکەیە . شیرین لە پاڵ دەنگی کۆرسدا هاوبیرو خۆشەویستی فەرهادە بەڵام لای نازم شیرێکی ئەنانییە ، بۆ دواجار بانگ هێشتنی فەرهاد ئەکات بۆوازهێنان لە کارەکەیو گەڕانەوە بۆ کۆشکی ئەمیرە ( مەهمەنە )ی خوشکە گەورەی . فەرهاد بە ڕازی نابێتو قوربانی بە عیشقی خۆی ئەدات ، بۆ عەشقی خەڵکی – انور هاتووە کۆرسو شیرینو پیرەژنو فەرهادی وەك چوار ڕوو پۆش ( قناع ) بەکارهێناوە . کۆرس بەرەی خەڵکی ڕەشو ڕووتو مرۆڤەکانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵن ، سەر فرازیو ئامانجی خۆیان لەدەستو بازووی فەرهاددا ئەبیننەوە . فەرهاد نموونەی بیرێکی تایبەتیو مرۆڤانەیە . کەسێکی دڵسۆز بە نەتەوەکەیەتی ، تینی ماسلکەو تەمەنی خۆی ، عیشقی گەورەی خۆی ، ئەکاتە مولکی ئەوان : –

**[ باخی نزی لێوی زەردی منالەکان**
**زەردەخەنەی شیرین ئەگرێ**
**ڕوباری ئاو بۆ گەروی شار ڕێگا ئەگرێ ] .**

پیرەژنیش نوێنەری دوو دەنگە ، دەنگی

کەس‌ئینتهازی‌و خۆ فرۆش‌و بێ ویژدانەکانی میللەتن ، هەروەها هێزی شەڕی داگیرکردن‌و گرتن‌و کوشتنە . ئەو هێزەی هەمیشە بە خوێن تینوویەتی‌ی خۆی ئەشکێنێت‌و تەورێکی گەورەی بەدەستەوەیە لە دووی فەرهاد ئەگەڕێت ، زۆرانبازی‌ی لەگەڵ ئەکات . لە گەردنی بەرزی زۆر – شیرین – ی عاشق‌و منالی بێ‌تاوان ئەدات .

ئنور هەروەك نازم ڕەنگی دوا ڕۆژێکی گەش‌و پڕ لە دەستکەوت بۆ میللەت زاڵ ئەکات بەسەر ڕەنگەکانی کەدا . لە پێشکەوتنی بەردەوامی خۆیدا ناوەستێت‌و لە وەرزی سەر هەڵدانەوە ئەگاتە – گولسورخی – مرا ببوس بە یەك دەنگ ئەڵێنەوە .

ئەو شیعرەی گولسورخی‌یە لای من لە پێشەنگی سەرکەوتنە فیکری‌و هونەریەکانی ئەنوەردا جێگای خۆی ئەکاتەوە . دەست لە دەستی – ئای تاتیانا – ی شەنگ – ئەنێن‌و لە – زریان – دا هەرگیز لەیادناکرێن‌و خۆڕاگرتنی زەمەنی شیعری‌و بە خۆ داهاتنی فیکری شیعری‌ی شاعیر لە زەمینەیەکی فراوانتردا بینج بەستئەکەن . ئێمە مادام باسمان لە ڕووپۆشەکان‌و ڕەمزی شیعری ( وەرزی سەر هەڵدانی فەرهاد ) کرد ئەبێت ئەو ڕەمزو ڕووپۆشانەی کەش کە شاعیر بەکاری هێناون دیاری بکەین ، ئەوانەش هەر یەك بە پێی دەلالەتی کاتی‌و جێگەیی لێکدانەوەو مەبەستی تایبەتی‌ی خۆیان هەیە [ خانی ، مەم ، زین ، عەربەت ، مەرگ ، خاك ، زریان ، مەولەوی عەنبەر خاتون ، نوری خوا ، گۆلاوە شینەکەی عەربەت ، بێستون ، بەمۆ ، پەلە گەنم ، کۆتر ، گمەی کوتر ، سیروان ، نازم حیکمەت ، گولسورخی ، ڤان کوخ ، پۆل ڕۆبسن ، مەشقەڵان ، حسەین ، زرێبار ، قومری سپی . ] هەموو ئەو ناوانانە لای ئەنوەر نیشانەو نموونەی بەرزی‌و خاوێنی‌و خۆشەویستین ، هەندێك جار زیاتر لە یەکێکیان لە شیعرێکدا کۆئەبنەوە .

هەندێك لەو ناوانە لای زۆربەی شاعیرانی هاوچەرخی ئەم بەکارهاتوون . کەچی ئەو زیندێتی‌و بارە سروشتی‌یەی بەکارهێنانی ئەمی تیانابینرێن ، واتە ئاوێتەی خوێنی ناو دەمارەکان ئەبن . ئەگەنە دڵ‌و لەوێشەوە بە هەموو ئەندامەکانی شیعرەکەدا بڵاوئەبنەوە . هەست بە پێوەلکاندن‌و بە ئەنقەستدانانیان ناکەین بە تایبەتی ، لە « گولسورخی »دا دەنگی شیعری ئەوو گۆرانی‌ی ( مرابیوس ) دێتە گوێ بەشێك لە مێژوو کۆئەکاتەوەو ڕووە تاریك‌و ڕۆ شنەکانی دیاری‌ئەکات . زیرەکانە لەو حاڵەتەدا ئەژیەتەوە ، کاتێك ڕۆزبێهیان بۆ دادگا ئەبردو زیندانییەکان بە ( مرابیوس ) بەڕێیان ئەکردن

**« مردن ڕێیەو ئەی پەری گیان**
**ئەی دامۆن گیان**
**دلگیر مەبن پیایا ئەڕۆم**
**تا لە دوورگەی دووری بەیان**
**گۆلاڵەو نان بۆ ملیۆنان – دامۆن – بێنم**
**مردن ڕێیەو ئەچم ئەخشەی شەنگ‌و تازەی**
**نیشتمانی غەریبانی لێ ئەهێنم »** .

بینین‌و هەستکردن بەتارمایی مەرگ لە نزیك‌بوونەوەی شاعیردا هەست پێ‌ئەکرێت لە ئەدەبیاتی فارسی . بە تایبەتی (فەروخی فەروخزاد). لایەنەکانی ڕەش‌بینی‌و وڕەبەردان ، پەنا بردن بۆ شەوو تەنیایی لەو ئەدەبەدا توانیویەتی دەوری ڕەش بینی‌ی خۆی لە شیعرەکانیدا بنوێنێت . ئەگەر چی ئەو ڕەش بینی‌و هەست بە لە دەست چوون‌و بەجێ هێشتنە نەك بۆ ئەم بەڵکە بۆ زۆر شاعیری تریش ئەبنە مایەی داهێنان‌و پیتی شیعریان . بەڵام بە گشتی لە ڕادەی ( شیعر لە پێناوی مرۆڤ ) دا شیعر دێننە خوارەوەو تووشی کەندو کۆسپی ئەکەن . شاعیری وا هەیە هەموو مەینەتی‌و تاریکی‌یەکانی ژیانی خۆی بۆ ئەبێتە مایەی گەش‌بینی‌و تەماشاکردنی جیهان‌و پەیوەندی‌یە مرۆڤایەتییەکانی بەو پەڕی بڕوابوون‌و هیوای گۆڕینی بۆ بارێکی باشتر . من لەوە دڵنیام ئەگەر فارسی زانێکی باش بوومایەو شارەزاییم لە ئەدەبیاتی نوێ‌ی فارسی ببووایە باشترو قووڵتر ئەمتوانی بۆ هەندێك لایەنەکانی شیعری ئەنوەر بچم . ئەمەش ئێستا لێ‌ی بە ئاگاین ئەنجامی ئەو چەند گۆڕینانەن کە جاروبار شاعیر خۆی‌و هەندێك برادەری تر ئەیکەن . بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو حاڵەتە تاریکی‌یە مەرجی سەرەکی ، کە بڕبڕەی پشتی بەردەوامی‌و گەش‌بینی‌یەکەیە بوونی فەلسەفەیەکی گەش‌بین‌و فراوان‌و قووڵە لەژیاندا . لەم ڕووەوە ئەتوانین ژیانی ( نازم حیکمەت ) و هێزی پڕ لە هیوای ئەو بەراوردبکەین . کە دەبوایە بەپێ‌ی ژیانی زاتی‌ی خۆی‌و ئەو هەموو بەندی‌و دەرکردن‌و نامۆیی‌و کارەساتە دڵتەزێنانە ڕۆژێك لە ڕۆژان شیعرێکی ئەووتایە کە هێندەی تاریکایی لە زیندانەکانی جیهاندا هەیە ئەوەندەش ڕووناکی لە دڵی ئەمدا مژدەی بە ئامانج گەیشتنی بدەنێ . بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەگەر

شاعیرێك هەندێك جاریش لەژێر تەنسیری ( نیتشەو شۆپنهاوەر ) دا خۆی بنێنێتەوە ، ئەمە بە تەنیا مانای تاقی کردنەوەی زاڵیو تاریکایی حالەتی زاتیی شاعیرەکە نییە بەڵکوو مانای نەبوونی فەلسەفەیەکی نوێی گەشبینو نەڕاونینە لە ژیان بە چاوی هێزو بیرێکی پێشکەوتن خوازنەوە .

**[ هاوڕێی هەموو هەورێ بووم**
**وەختێ ئەبارین**
**دوو سێ دڵۆپ باراقیان**
**بەسەر دەوەنی تینوبە ئیما**
**نەئەباران جاری ]**

**[ گەر شێت نەبم من لە کوێو دەست لە ملی وڵات**
**کردن لە کوێ**
**گەر شێت نەبم من لە کوێو هەڵمژینی هەڵاڵەی**
**لێوی ـ کابوول ـ ی یار لە کوێ ] .**

**[ شەپۆلێ بووم باڵم گرتو شێتبووم**
**دەمم نەنایە دەمی کەناری ]**

لەو گێژاوە فیکرییەی شاعیر تیایدا ئەسووڕێتەوە، گەلێك هەستو بیر کردنەوەو بۆچوونی بۆچوونی ئایدیالیستانە دێنە شیعرەکانیەوە ئەو لە دەست چوونەش لە ( کۆچی شازادە ) دا تووشی هاتووە ڕەنگدانەوەو تەقینەوەی ئەو خەمناکیو کپیو بێئارامییەی ناخێتی کە ئەشێت ئەنجامی پەنگ خواردنەوەیەکی کاتیو ڕۆژو دووان نەبێت :

**[ سە هەڵئەگرم لە و لاتی غەریبیدا**
**دوور دوو لە تۆ ئەچمەوە باوەشی خاك ] .**

چوونەوە باوەشی خاك ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەم لەسەر ئەو ڕایەبێت مرۆڤ لە خاك دروست کراوەو ئینجا گیانی کراوە بە بەرداو ئادەمو حەواش باوكو دایکی هەموو کەسن . ئەو سەر هەڵگرتنو تەسلیم بوونەو بڕوابوونی بە چوونەوە بۆ ئەو خاکەی لێوەی دروست کراوە تێکەڵ بە ( کۆچی شازادە ) دەبنەوە . سەر هەڵدانی ئەو ئیحایەش هەر لە کۆچی چاوەڕوان نەکراوو ئەبەدیی ئەوەوە بووە . گیانی خۆی بە دارێکی زڕ ئەزانێتو ئەویش هۆزارێکی شەنگو خەمناك :ـ

**[ هۆزارێ بووی شەنگو خەمناك**
**لەسەر داری زڕی گیانی سووتاوی ئەنوەر**
**هەڵنیشتیو**

**هەڵیش فڕیت**

**تۆ لە لای من منال نەبووی ـ زۆر گەورە بووی ] .**

لای ئەنوەر سەرکەوتنێك هەیە ئەویش لە بەرانبەر ئەم کەوتنو تەسلیمبوونە بەستنەوەی بە هێزی بنچینەی پەیوەندیی ئافرەتو خاکە کە ئەمە خۆی لە ڕاستیدا ئافرەتو مەسەلەیەك ئەگرێتەوە . لای ئەویش لە ڕووە نەتەوایەتییلکەوە تێکەڵ بە بیرکردنەوەو تایبەتیەتیی شیعرەکانی ئەبێتەوە .

لە سەرەتای نووسینەکەدا بڕیارێکی وەهام دا کەشیعرەکانی ئەنوەر لە زەمینەیەکی ڕۆمانتیکیانەدا هەڵ ئەچن ، خورپەیەکی ناوەختو هەندێك هەستی تیژڕەون ، ئەنبەخەلفە چنارێکی شەنگ ، لقو پۆ دەرئەکەن . بەرەو ریالیزم ئەڕۆنو هەندێك جار شیعری وەکو ( گولسورخی ) و ( ئێوارەیەو کۆچ ئاگرە ) پێك دێنن . بەڵام ئەمە هەموو کات لای ئەنوەر ڕوو نادات بەرانبەر ئەمانەش تێ شکانو وێنەی سریالیو بەزینو گەڕانەوە بۆ کەم دەستەڵاتیو بێ بەرێتی ژیانی مندالی دێنە پێشەوە ، ڕۆمانتیکیەکان بەوە تەبریری هەڵوێستی خۆیان ئەکەن کە پەنابردنی ئەمان بۆ گۆشە گیریو سروشتو دوور لە خەڵكو ژیانی شارەکان ئەوەیەکە نایانەوێت بەشداریی لەو تاوانو کردارە ناڕەوایانە بکەن کە لە شارەکاندا ڕوو ئەدەن ، دێهاتەکان ئارامن ، هەواو ئاوو خاك ، مرۆڤو خۆشەویستی خاوێن ، هەموو خاوێنن ، گەلێك جار مرۆڤ کە سنگی قورس ئەبێتوا هەست ئەکات لەژێر باری خەمێکی قورسدا تێك ئەشکێت ، پەنا ئەباتە بەر ئارامیو کپیو سروشتی جوان ، پالی جیای بەرزو پێ دەشتی بەرینو ڕەنگین . ئەوە ئەو هەستە ڕۆمانتیکیە نییە کە مرۆڤ ئیتر لاوازەو ناتوانێت بەرەنگاری خەمە قورسەکەی ببێتەوە . ئەمە مەرج نییە . هەندێك کەس هەن لەزەتێکی ڕۆحی لە سروشتو ئارامی وەرئەگرن . کەسێکی ڕووخاوو پاش کەوتووش نین . بەڵام ئاوات خواستن لەهەر گەڕانێك یە دوای ماندوویێتیدا ئەبنە هەر دوو لایەنە سلبیو مایەی ڕەخنە لەسەر شاعیریەتیی ئەو .

خاوێنیی سۆفیەتیو خاوێنیی مندالی لەم لاو لەو لاوە دێنە شیعرەکانیەوە چاوەڕێی تۆزێك لە نووری خوا ئەکات ، لەهەورێك ڕائەمێنێت ئاخۆ ببارێت یان نەبارێت ، مەلێکی نوورانی ، قومرییەکی سپی‌سپی ئەبنە هەموو بوونو دۆزینەوەو وونبوونی، ئەبنە خاوەنی پەیامێك لە خواوە بۆ هەستی سۆفیانەی ئەم :ـ ( ئەو شوەیلە باوەشی سروشتدا مۆرکی

ڕۆمانتیکیەکانە ، بیرو باوەڕیان خەڵوەت گـــەری‌و دوورە پەرێزییە لەخەڵك ، چونکە کۆمەڵ نەخۆشە ، سەرچاوەی گیروگرفتە ، بارێکی قورسە بەسەر شانی کەسە هەست ناسك‌و دەروون کەیلەکان ) (٨) .

خوشەویستی سەرنەکەوتـــوو ، هەندێــــك بیرکردنەوەی سۆفیانە تێنەگەیشتنێکی قووڵ لـــە بنەڕەتەکانی ئیئوری پێشکەوتن خوازانە ، تێ‌شکانی هەندێك هیواو ئامانجی لە ناکۆکی‌و تێ‌شکانی ئاوات‌و خواستی نەتەوەکەی . لە ماوەیەکی درێژی مێژوویدا ئەمانە کۆئەبنەوەو ئەیخەنە زۆر دژواری‌و ڕوانینــی تەسك‌و ڕەش بینەوە .

ئافرەت لە ژیانی هەرچی شاعیرێکدا بێت ئەگەر هەموو شتێکی نەبێت ئەوا کەمیشی نی‌یە ، زۆرشت هەر بە ئاشکراش دیارە انور چەندە ئەسیرێکی بـــێ دەرەتانی ئەو عیشقە بووە ، ناوی لێ ناوە شازادەو خوشی‌ویستووە ، شیعری بۆ ووتووە : ـ

**« تۆ لە لای من منال ئەبووی زۆر گەورەبووی**
**گەورەییەك ئەمئەنۆوانی بە زار بیلێم »**

بەم جۆرە خەیاڵی ڕۆمانتیکی‌و بێ هیوایی‌و ماڵ ئاوایی ئەو ئافرەتە لە بازنەیەکی تەسکداگیری ئەدەن ــ دەرفەتی نادەن ــ بواری لێ ئەتەنن ، پردەکانی لـــە بەردەمدا ، لەبەرپێدا ئەڕووخێنن ، دەریابەرینەکانــی ووشك ئەکات ، زریان هەموو شت خول ئەدات‌و نوغرۆی ەکات ، بالندەو هێلانــە ، مرۆڤ‌و نیـــاز ، چیا بەسەر دەشتدا ئـــەڕووخێنێت ، زەوی وەك لۆکەشی ئەکاتەوە ، ڕەشماڵی ماڵێکی کۆچـــەری هەڵئەگرێت ، گەلە گورگێکی برسی ئەباتە سەر رانە مەڕێکی ئاوارە ، خاك‌و خۆشەویستی لە بەرامبەریدا واق‌ووڕماو دڵۆپێك فرمێسك لەسەر گۆنای نامێنێت‌و ئەبێت بە هەلم ، ئەستێرەکان مەداریان تێك ئەچێت‌و ڕووی ڕۆژ وەك چاوێکی خوێن تێ‌زاو ، سوور سوور دائەگیرسێت . چرای سەر قافڵەی کاروانێـــــك ئەکوژێتەوە ، ڕێگایان لێ ئەگۆرێت‌و هەر ئەڕۆن ، ڕێ دەرناکەن ، پەی بە نهێنی‌ی تاریکی‌ی شەو نابەن .

کچێك ئەمی بەجێ‌هێشت‌و شیعرێکی بـــە ئەمانەت لە دڵیدا دانا هەتا بەسەر یەکتردا ســـۆز بکەن ، ئەم بەسەر ئەوداو ئەویش بەسەر ئەمدا هەر [illegible]رین ، گریانێکی بێ ئامان بگرین . خۆشەویستییەکەی ئەنوەر هەموو جار خەڵك ناگرێتەوە . بگرە کەناری مەرگ‌و ژانە بە سوێ‌کانیشدا تێ‌ناپەڕێت . تەنیا خۆی‌و ئەمون ، ئەبێت بە وێنەی ڕۆمانتیکی‌و کلاسی‌و ئەگەڕێتەوە .

**[ لەگن من با وجودی ناس‌و ئەجناس**
**کەسی تێدا نی‌یە ئەم شارە بێ تۆ**
**هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەم ساڵ**
**تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ ] (٩) .**

هەر ئەو تاك پەرستی‌و دڵدارییە ئەبنە هەوێنی عیشقی لایەنە کزە سۆفیانەکەی‌و زۆر جار هەمووی لە نووری خواو قومری‌یە سپیەکاندا ئەتـــوێنێتەوە . بی‌دەستەلات گۆشەگیر دائەنیشێت وەك بڵێت خوایـــە بەزەییەك ، تیشکە ئایـــدیالیەکانی بەســـــەردا پەخش ئەبن‌و تەواو خۆی ئەدات‌بە دەستەوە،ئەبێتە مرۆڤێکی ئایدیالیستی لەو ئەوەستێت‌و بەو تیشکە ئایدیالییە ئەیەوێت ڕوناکییەك بخاتە ناو : ـ

**« بمدەرە دەس سەرماو سۆڵە**
**گشت پەنجەرەو دەرگاکانم لەسەر داخە**
**لێت دڵگیر نیم**
**تەنیا جارێك وەکو جاران**
**وەرە وەرە بە پیرمەوە »**
**« تۆش بێزراوی**
**دەها چاوم دەها دڵی بیابانم**
**دەها وڵاتی بەرین‌و بێ هەتاوی**
**شیعری بێ بارانم .. »**
**« پڕ‌و پوشی هێلانەکەت لەسەرداری ڕوت‌و قونــی وەرزی من بەجێ‌هێشت‌و بۆ خۆشت دات لە شەقەی باڵ »**

مرۆڤی شاعیر هەندێك جار ئەکەوێتە حاڵەتی سەیرەوە ، ئەیەوێت هەر بۆ خۆی بژیت ، خۆی‌و ئەو ، ئیتر ئەوانی تر ، خەڵك ، ئەبنە کۆمێکی وەستاوو هەر زوو بە تیشکێکی کوت‌وپڕ بە شێوەی هەڵم بەرز ئەبنەوە . ئەگەر شاعیر لەم ڕۆژگارەدا بـــەرپرسیار نەبوایە ڕەنگە وەك خەڵکە سادەکەی کـــە گەلێـــك ڕواڵەت‌و حاڵەتی لاوەکی لێ وەرگیرایەو ئاسایی تـــێ بپەڕیایە .

بەڵام ئەم لە پێش ئەوانەوەیە ، کەم‌و زۆر هۆشیارانەو زووتر لە کارەساتی جیـــاوازە چینایەتـــی‌و کێشە نەتەوییەکە ئەگات‌و شی‌کردنەوەی خۆی هـــەیە . مەبەستیشم لەو جۆرە بیرکردنەوەیە نی‌یە خەڵـــك هەمووی ببنە خاوەنی مەبەستی خۆیان‌و بگە نە جێ ، بەڵام شاعیرەکە کەس ئاووڕی لێ نەداتەوەو لـــەو سامانی دەست‌کەوت‌و تێکۆشانە هیچی پێ نەبرێت . نەء بەلکو ئەم حسابە ووشکە لە هەندێك ئیئوری خۆ

کردو قسەی زلدا دێتە پێش کە فری بەسەر فەلسەفەی شیعرو ساتە ناسکەکانی شیعرو مەدای مێژوویی‌و بڕکردنی دەنگی شیعرەوە نی‌یە . ڕوانینێك بۆ ئەم کێشەیە کە پێچەوانەی ئەوەی تر بێت خۆشەویستی‌یە بە مانا فراوانەکەی خۆشەویستی‌یەك لە ئەنانیەت‌و زاتییەت‌و خۆ تەرخان کردن بۆ تاکە کەسێك ، دووربێت ، لەو عەشقەی تاك‌و کۆ پێکەوە گرێ بدات . جوانی لە هەمەکی‌و هەندەکی‌دا ، بەدی بکات . ( هەمەکی ) ش هەرگیز قەناعەتی بەوە نی‌یە بەشێکی لێ دابڕێت‌و نیگاری تەواوی خۆی کەم‌و کوت دەرکەوێت . لەبەر ئەوەی پارچە بەشێکە لەهەموو ، ئێمە کە خاوێنی‌و ڕاستی کێشەی هەمووومان دۆزیبەوە ، زۆر ناڕەوایە پارچە جوێ بکەینەوەو بە دیوێکی مەوزووعەکەدا هیمای بۆ بکەین . [لە جیهانێکدا کە ڕووی جوانت نەخشین ترە لەوێنەی گوڵ لە ئاوێنەدا ، لێرەدا ، لەو جێگەیەدا کە نوقوم‌بوونی تەواوە هەموو بوونم ئەبێت بە سۆزێکی بە لێشاو ئەوەش خۆشەویستیە،ئەو خۆشەویستیەی هەموو کەس ئەگرێتەوە ] (١٠) . لای من تایبەتیەتی‌ی ئەو دژواری‌و هەندێك تێ شکانەی ئەنوەر ئەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی فەلسەفەیەکی نەگۆڕاوی بنج بەستی شیعری ، ڕەنگە ( گولسورخی ) و ( تاتیانای شەنگ ) و ( پۆل ڕۆبسن ) تەواو دژوار بووە ستنەوە لەگەڵ گەلێك شیعری دیوانەکەدا ، بەتایبەتی لە ڕووی ڕێبازی فیکری‌و هەلسەنگاندنی چەند کێشەیەك . شیعرەکان یەك ڕێچکەیان نەگرتووە ، ڕێگاکەیان پڕە لە بەرزی‌و نزمی ، کۆسپ قورتی گەورە ، هەندێك جار هەموو شت لای شاعیر لە تۆزە نوورێکی سەوزی خوادا کۆئەبێتەوە ، کە شاعیر تەواو تەسلیمی ئەو بیرە ئایدیالی‌یە ئەبێت‌و هەتادێت دیوارەکانی ژوورەکەی دێنە پێشەوەو ماوەو دەرفەتی تەنگ‌و تەسك‌ئەبێتەوە ، ناچار ئەخنکێت‌و خۆی بە مردن ئەسپێرێت . ئەیەوێت جارێکی تر نەیەتەوە ژیان ، دوور دوور بڕوات‌و خەونەکان فەرامۆش بکات . ئەمە حسابی گشتی‌ی دیوانەکە نی‌یە بەڵکوو تەنیا وەستانە لەسەر ئەو لایەنە زەقانەی کە زیاتر دژواریەکان لە نێوان ڕەوتی فیکری شیعرەکاندا پەرەپێ‌ئەدەن ، زیاتر لە پێویست سەریان پێ هەڵئەدات ، مۆرکی ڕۆمانتیکی‌و هەندێك تیشکی ڕۆمانتیکی‌و میتافیزیکی شیعری فارسی دێتە شیعرەکانەوە . ئەکەوێتە ژێر تەئسیریانەوە ، بە دەگمەن وەك یەك نموونەی شیعریی گوڵسورخی‌و دەنگی مرابوس دێتە گوێ ، لە چاوی ئەو دیاردانەوە تەماشای ژیان‌و خۆشەویستی ئەکات لەهەمان‌کاتیشدا ئەو دیاردەیە بە لایەنە ئایدیالیەکەیدا کەرت بوون‌و ەرشی فیکری شاعیر کۆئەکەنەوەو ئامادەی ئەکەن بۆ گرتنەبەری ڕێگایەکی نزیکتر لە خواو چۆنیەتی گۆڕانکاریە بەردەوامەکانی سروشت . سەردەمی منالی‌و گەشە کردنی هەستی منداڵی‌ی ئەو خێزانێکی ئاینی‌یەوە هاتووەکە دی‌و هەڵچووە .

به شیعری مەولەوی گوێی زرنگاوەتەوەو ئەشێت هەر لەو دەنگەوە عەشقی بیر لێ‌کردنەوەو حاڵەتی سۆفیەتی بووبێت ، بەڵام ئایا ئەنوەر چۆن مامەڵەی لەگەڵ کێشەی سۆفیەتی کردووە ؟؟ ئایا ئەو تیشکانە لە سەراپای شاعیریەتی ئەنوەردا چۆن دەرئەکەون ؟ پێشەکی ئەلیم ئەو تیشکانە تەنیا وەك شتێکی لاوەکی‌و لا تەریك ، کەم نەفەس‌و تیژڕەو بە شیعری ئەنوەردا تێ ئەپەڕن : ـ

**« تیشکی وێنەی ڕوخساری خوا لە ئاسمانی پاکی دڵیا**
**لە پڕ دەرکەوت‌و ونیش بوو »**
**« گەر نیهالی هەڵچووی ئازار**
**بە تەوری وەرزی ببڕم**
**گزرەیەکی وای تیائەبێ ، گەر داگیرسێ**
**تین‌و هاتای مەشقەڵانی بەرزی ئاگر**
**بە ڕووی دووری پڕ لە نووری خوادا ئەچێ »** .

مەولەوی کاری گەری تەواوی خۆی لە شیعری ئەنوەردا نواندووە . بەڵام زیاتر لە ڕووی ونەی شیعری‌و ئەو نەغمە فۆلکلۆریەی هەیەتی دەنا وەك بیرو هەستی سۆفیانە بە دەگمەن بەلایدا ئەچێت .

زۆر جاریش دوورە پەرێز لێی ئەوەستێت ، ئەمەش بە پێی لێکدانەوە زانستیەکەی مەفهوومی سۆفیەتی ئەتوانین دیارو ئاشکرا بە ڕواڵەت‌و ناوەڕۆك دەست نیشانی بکەین .

لەم شیعرانەدا تارمایی ( مەولەوی ) ئەبینرێت لە ڕووی ناوهێنانی مەولەوی ئەوانەی پەیوەندی داری نزیك‌بوون بە مەولەوی‌یەوە شیعرەکانی وەك [ زیندە خەوو تارمایەکان ، ئێوە ئەو بایەن کێو لە بن دێنن ، زریان ، وەرە خواری نەی خواکەی غەریبان ، سۆناتەی تینویەتی ، سامال ، خاك‌و زریان‌و خۆشەویستی، بمدەرە دەس سەرماو سۆڵە]، لەو شیعرانەدا تەئسیرەکان ڕووکەشن ، ناو هێنان‌و وێنەی شیعری‌و کێشە شیعریە دەبڕگەیەکەیە .

هەروەها سۆفیەتی فەلسەفە نی‌یە ، بەڵکوو ڕێبازە ، تاقی کردنەوەیەکی گیانی‌یە ، گەڕان‌و ماندووبوونە بە شوێن هەقیقەت‌و شتەو هەرە خاوێن‌و بێ گەردو بەرزەکاندا .

لەحاڵەتی سۆفیەتیدا ئەوەی پیرۆزو شایەنی ڕێزو کڕنووش بۆ بردن‌و بەرزێتی‌یە تەنیا خوایەو بەس . [ خوا هەموو شتەکانە ئەڵێم هەموو شت لە خوادا زیندووەو ئەبزوێ ، پەنهان‌و نهێنی‌یە ] (١١). [ ئیرادەی خواو یاساکانی سروشت دوو ناون بۆ یەك ڕاستی بەکاردێن ] (١٢) .

کەواتە هەموو شتەکان لە خوادا کۆئەبنەوە ، لە هێزێکدا کە تواناوتینی هێزەکانی کەیە . سۆفی ئەم بۆچوون‌و بیرکردنەوەیەی هەیە . سروشت ، یاساکانی گۆڕانی ، بە پێی نیازو ئارەزووی خوا ئەجوولێت ، هەوڵی هەمیشەیی ئەو بۆ نزیك‌بوونەوەیە لە خوا ، لەساتە هەرە سەخت‌و ناهەمواریەکانیدا ، ناوی خوا دووبارە ئەکاتەوەو داوای بەخشینی لێ ئەکات ، ساتێك ئەگەر لەو زیکرە غافڵ بێت بە ناتەواوی‌و بێ ئاگایی ئەزانێت دەرهەق بە خۆی . ئەنوەر شاعیرێکی سۆفی نی‌یە ، هیچ شیعرێکیشی نی‌یە حاڵەتی سۆفیەتی‌و باوەڕی سۆفیانەی تیادا بێت . بەڵکوو هەندێك دەلالەتی هەیە وەك تیشکێك گوزەر ئەکات‌و ئەکوژێتەوە . ئەوەش کە وەهای لێ ئەکات گەلێك جار حاڵەتی تەسلیم بوون وەرگرێت نەبوونی بەدیلێکی فیکری‌ی مادی‌یە ، هەر بۆیە شتە ڕوحیەکان لای ئەو جێگای خۆیان ئەگرن .

دووەم هۆ بۆ ئەوە دیارەدەیە گەڕانی شاعیرە بە دوای ئەوپەڕی خاوێنی و بێ گەردی‌ی شتێکدا کە دەستی مرۆڤ نەی‌گەیشتبێتێ ، ئەم خاوێنی‌و خاسیەت‌و جەوهەری عیشقی خۆی لەودا بەدی ئەکا ئەمەش مەزاجێکی ئەفلاتوونی دروست ئەکات ، کە مەزاجی فەلسەفەی شیعرە ، بە تێکەڵ‌بوون بە ڕێبازێکی ئاینی ، ئەم ڕێبازە لای ( ئەفلۆتین ) هەبووەو لە ئەوەی تازەش وەك ( سپینۆزا ) ئەم ڕێگەیەیان گرتووە [ جەوهەری سۆفیەتی حاڵەتێکی یاخود تاقی‌کردنەوەیەکی گیانی‌یە ، کە سۆفی تووشی دێت . فەلسەفەش نی‌یە بەو مەبەستەی فەلسەفە هەیەتی کە بریتی‌یە لە ووردبوونەوەیەکی عەقڵی‌و تیئۆری لە سروشتی بوون‌و سۆفی فەلسەفەی ئەوە لێ‌نادات کە تاقی‌کردنەوە ڕۆحیەکەی بکات بە بناغەی تیئورێکی میتافیزیکی لە سروشتی بووندا ] (١٣) .

لە ئاستی شیعرەکانی انور گەلێك شت خۆ نادەن بە دەستەوە ، نهێنی‌ی شیعری باش لەوەدایە ، لە خوێندنەوەدا هەست ئەکەی بە شەقامێکدا ئەڕۆیت‌و یەك دەنگ گۆرانییەکی مەنگ‌و لەسەر خۆت بۆ ئەڵێت ، ئەو کەرەسانەی لای ئەم دەست ئەکەون لای کەسانی تر دەگمەنن یاخود هەرنین . ئەگەرچی هەندێك جار کەرت بوون‌و « ضیاع » ێکی تایبەتی لە شیعرەکانیدا هەست پێ‌ئەکرێت بەڵام ئەو ڕاستەقینەی ناخی خۆی ئەنووسێتەوە ، واتە ون‌بوون‌و دۆزینەوەکە هاوشانی یەك ئەبنەوە ، ئەگەر شیعری سەرکەوتوو هەموو گەردوونیش لە دڵی خۆیدا کۆئەکاتەوە ئەتوانێت شاهیدی دروست‌بوون‌و حەقیقەتی ڕووداوە سامناکو خۆش‌و ناخۆشەکانی تەنیا ئەستێرەیەك بێت لە گەردووندا . لە« زریان »دا چەند شارێك وێران ئەبن‌و ئەکەونە بەرەی ون‌بوونەوە ئەم بە مێژویان ئەسپێرێت ، چەند شارێکی تریش ، لە تەنیشت یەکدا پڕ ئە لیژگی خۆرن ، لە سۆناتەی تینویەتی ئەمدا ، تیشکی هەتاو مەقەستێکە هەموو داوێك ئەقرتێنێت ، فەروخی فەروخزاد ئەلێت [ هەندێك شیعر هەیە نە دەرگایان کراوەتەوە ئەداخراون ، چوارچێوەیان هەر نی‌یە ، شەقامێکین کورت یا درێژ ، ئینسان هەیە ئەڕواو هەیە ئەڕواو ئەگەڕێتەوە ](١٤) . شیعری انور لە ئەنجامدا کۆمەڵێك نهێنی ئەهێڵنەوە ، خورپەیەکی کاتی‌و ساتێکی شیعری لای خوێنەر نابێت بە تەنیا لە بیربوونی کاتی خوێندنەوەکەو لە پاشدا ون‌بوونی ، لە شیعرەکانیدا زۆر نیازو هەقیقەتی بیری پێشکەوتنخوازانە وون ئەبن ، جۆرە بیرێکی ئایدیالی‌و تیشکی سۆفیەتی دەرئەکەون ، ئەم بە هەنگاوێك لەبۆچوونی‌دا لە هەستی نەتەوایەتی خۆیدا ئەیان دۆزێتەوە . ئەگەریش زیاتر بە ناخی ( گولسورخی )و ( نان‌و گولەکەی ) نازم حیکمەتدا ڕۆ بچێت ، هەڵبەت هەنگاوێك ئەبێت بە دوو ، زیاتر ئەچێتە پێشەوە ، گۆشە تاریکەکانی ئەو بەهرەو شاعیریەتەش وەك چراخانێك دێتە بوون‌و ئیتر ئەمیش هەمیشە شیعرێکی تێدا ئەنووسێتەوە ، هەر ووشەیەکی ئەوەندەی فرمێسکێك لە چاوی‌دا مات بوو بێت ، ئەوەندەی خەندەیەکیش تەمەنی ئازاری هەموو سەر زەوی لەتەمەنی ئەمدا بتوێنێتەوە !

## سەرچاوەکان

تێبینی

ئەو شیعرانەی بەشێك یاخود واتایەکم لە لێکۆلینەوەکەدا بە نموونە هێناوەتەوە هەموو لە « زریان » دا هەن . بە پێویستم نەزانی ناو نیشانو ژمارەی لاپەڕەکانیان بنووسمەوە .


(١) چاوپێ کەوتنێك لەگەڵ ئەنوەر قادر محمد — ڕۆژنامەی ( العراق ) ١٣—٩—١٩٧٦ .

(٢) دیوانی مەولەوی — ل ٥١٥ — کۆکـــردنەوەو لێکدانەوەی — مەلا عبد الکریمی مدرس .

(٣) دیوانی حەمدی — ل ١٣٤

(٤) سروشتو دەروون — گـــۆران — شـــیعری ( هەوری پایز ) .

(٥) پێشەکیی شانۆگەریی — شیرینو فەرهادی نازم حیکمەت . گۆڕینی — اکمل الدین احسان.

(٦) زریان — ل ١٤

(٧) شیرینو فەرهاد — نووسینی نازم حیکمەت .

(٨) الرومانتیکیە — محمد عنیمی هلال — ل ١٦٩

(٩) دیوانی نالی — د. مارک خەزنەدار — ل ٩١

(١٠) الازهار تورق داخل الصاعقة — حسین مردان— ل ١٩٨

(١١) قصة الفلسفة — ول دیوارنت — ل١٥ .

(١٢) هەمان سەرچاوە .

(١٣) التصوف — الثورة الروحیة فی الاسلام — د. ابو العلاء عفیفی .

(١٤) کەروخی فەروغزاد — شیعرو ژیانی — گۆڕینی — انور قادر محمد — ڕۆژی کوردستان ژمارە (٤) سالی ١٩٧٦ .


---

دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێ ، کە کارێکی بایەخداری هونەری یا ئەدەبی وەیان هەر شاکارێکیتر کە بەئەنجام دەگەیێنرێ .. خاوەنەکەی بناسین‌و بزانین چۆن ئەو کارەی بەئاکام گەیاندوە .. جا ئەگەر بەرهەمهێنەری کارەکە بەپۆر بووو سەرجەم کات‌و خوێندن‌و وەزیفەکەشی هەر لەو مەدارەدا گیرسابۆوە .. ئەوا وەك بەرپرسیارێك داواو چاوەڕوانی لێدەکرێ کە خزمەتی خۆی لەو بوارەدا چالاکانە پێشکەش بکاو بەرهەمەکەش هێندە مەیبوو پوخت بێ کە لە ئاستی ئەو بارە لواوەدا بێ کە بۆی رەخسێنراوە .. بەڵام ئەگەر هات‌و خاوەن بەرهەم شاکارێکی شیاوی هێنایە کایەوەو هیچی بۆ نەرەخسێنرابوو .. تەنیا ئەوەندە نەبێ لە خۆی ببرێ‌و قوربانی بە کات‌و ئیستراحەت‌و خەوو خۆشی




بدات‌و سەرەڕای ئەو کاروفرمانەی کە ژیان‌و دەرامەتی پێ مەیسەر دەکات ئەم کارو بەرهەمەیشی بخاتە پاڵ .. ئەوا ئەمەیان پێویستە بە چاوی رێزو خۆشەویستی‌یێکی تایبەتێوە سەیری بکرێ‌و پایەو نرخی شایستەی خۆیشی پێ بدرێ .

عومەر مەعروف بەرزنجی کە دانەری کتێبی « لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی » ە.. مامۆستایێکی قوتابخانەیێکی سەرەتاییەو .. هەمووشمان دەزانین کە سەرەڕای ئەو ئەرکە پەروەردەیە پیرۆزەو دەوامی رۆژانەی مامۆستایانیش .. پیویستیان بە خۆئامادەکردنە بۆ رۆژی داهاتوو ئەمەش کاتێکی کەم یا زۆری ژیانیان دەگرێتەوەو نووسەریش لەپاڵ ئەم ئەرك‌و دەوامەشی‌دا.. بەو کتێبە خزمەتێکی پەسەندکراوی ئەدەبی کوردیمانی کردوە ..

ئەم وتانەی پێشووم ئەوە ناگەیێنێ کە نەخرێتە بەر سەنگی مەحەك‌و وەك خۆیشی داوای کردوە کە « بەچاوێکی رەخنەو راستکردنەوەو بژارەوە » سەیری کارەکەی بکەین‌و لە ناتەواوێکانی چاوپۆشی نەکەین .. بەلکو بەپێچەوانەوە چ بۆ نووسەر خۆی‌و چ بۆ خۆینەرانیش پێویستە هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکەین‌و بەپێی توانا شیکردنەوەی وردو سەرنجی دڵسۆزانەی خۆمانی پێشکەش بکەین .

**قۆناغەکانی چیرۆکی کوردی‌و هەوڵدانێك بۆ جیاکردنەوەی بابەتەکان :**

نووسەر چیرۆکی ساڵانی ١٩٢٥ تا ١٩٦٩ ی بەسەر سێ قۆناغدا دابەشکردوە .. بەکورتی « سەرهەڵدان ٩٢٥ تا ٩٣٩ » و « برەوپێدان ٩٣٩ تا ٩٥٠ » و « گەشەکردن ٩٥٠ تا ٩٦١ » و دوای ئەوەش تا ساڵی ٩٦٩ بە « سەردەمێکی کپ‌و بێدەنگ » ناوی دەبات .. کە بەتەواوی ئەم بۆچوونەی عومەر لەگەڵ ئەوەکەی حسێن عارفدا کە لە کتێبی « چیرۆکی هونەری‌ی کوردی » دا دەربارەی قوناغەکان دەری بڕیوە یەك دەگرێتەوەو ئەمەش جێی سەرنج‌و تەنانەت سەرسوڕمانیشە کە کە چۆن بەپێی ساڵ‌و بەو جۆرە دابەشیان کردوەو کەسیشیان سیمای تەواوی « قوناغ » ەکانیان دیاری نەکردوەو کاتی خۆی لەهاوکاری‌دا لەم‌بارەیەوە سەرنجی خۆمم خستەڕو ..

**بەڵام ئەوەی جێی رەزامەندیەو لە باسێکی**

**زانستیانە نزیکی دەخاتەوە ئەوەیە کە بەرزنجی هاتوە سەرباس و ناونیشانی بابەتی داناوەو بە بەراوردکردن و لێکۆڵینەوەیێکی گونجاوەوە بۆ هەر بابەتێك کۆمەڵێ چیرۆکی بە نموونە هێناوەتەوە .. وەك « ئرکەی جوتیارو کرووزانەوەی هەژارو زەبری دەرەبەگ « و گیروگرفتەکانی ئافرەت » .. هتد .**

بەداخەوە .. ئەمەش لە هەنگاوێکی کورت زیاتر نیەو نەگەیشتۆتە پلەی هەڵسەنگاندنێکی زانستیانەی تەواو .. چونکە نوسەر ئەم ناونیشان و سەرباسە بابەتیانەی بۆ هەر « قۆناغ » ێك جیاکردۆتەوەو نەهاتوە هەر «٤٥» ساڵەکەی تەمەنی چیرۆکی کوردی بخاتە ژێر باڵی ئەو ناونیشانە جیاوازانەوە .. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ناچار بوە لە « قۆناغ » ی سێیەمیش‌دا ناونیشانی نزیك و لەیەکچوو دووبارە بکاتەوە .. وەك « خەباتی جوتیارو دەسەڵاتی دەرەبەگ و موچەخۆری بیرۆکراتی » و « لەکەوساندنەوەی ئافرەت لەسایەی رژێمی دەرەبەگێتیدا » .. هتد ..

گەر ئەمانەی یێك‌خستبایە ..ئەوا سەرکەوتنێکی باشتری بەدەست دەهێناو باسێکی وردو پوختی لێ پەیدا دەبوو ..

هەر لەم بارەیەوە دەمەوێ بپرسم بۆچی لە « قۆناغ » ی سێیەمی چیرۆکی کوردی‌دا لە ساڵانی ٩٥٠ تا ٩٦١ دواوەو نەی‌گەیاندۆتە ساڵی ٩٦٩ ؟! چونکە کاتێ ساڵانی ٩٦٢ تا ٩٦٩ جیادەکاتەوەو ناونیشانێکی سەربەخۆی بۆ دادەنێ « سەردەمێکی کپ و بێ‌دەنگ » .. دەبێ لەسەر کام « قوناغ » حسێب بکرێ ؟! جا هەر ئەم مەسەلەیە رامان دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی بە هەر بارێك‌دا بیخەینەوە ناتەواوی قۆناغ دانانمان بۆ ئاشکراتر دەبێ کە لەسەر بنچینەی ساڵ دانراون و بەو جۆرەشن کە تا ئێستا باسیان لێ‌کراوە..کە تایێ کێشەکان ئاڵۆزتر دەکات و تەنیا یاریدەیێکی نووسەران و لێکۆڵەرەوان دەدات و باسەکەیان تا رادەیێك ئاسانتر دەکا ..

ئەمجا هەر ئەو « سەردەمە کپ و بێ‌دەنگ » ەی بەرزنجی باسی دەکات .. سەیر دەکەین تەنیا چوار پێنج ساڵێکیان چیرۆك تیای‌دا دەگمەن بڵاوکراوەتەو ئەویش ساڵانی ٩٦٣ تا ٩٦٦ و ئیتر لە ساڵی ١٩٦٧ تا ٩٦٩ زیاتر لە «١٠٠» چیرۆك بڵاوکراوەتەو لەمەش‌دا چەندەها چیرۆکنووسی ناودارو بەتوانا بەشداریان تیاکردوە .. وەك محەرەم محەمەد ئەمین و محەمەد مەولود « مەم » و د. مارف خەزنەدار و حسێن عارف و جەمال بابان و کاکەمەم بۆتانی و تایەر ساڵح سەعیدو سەدرەدین عارف و چەندانی‌تریش وەك نووسەر خۆیشی دەرکی بەم راستە کردوە .. بەڵام هەر لەبەر رۆشنایی بیبلیۆگرافیاکەی بەرزنجی خۆی‌دا دەردەکەوێ کە هەندێ جار لە ماوەی نزیکەی شەش ساڵ‌دا تەنیا چوارپێنج چیرۆك بڵاو کراوەتەوەو بە سەردەمی « کپ و بێ‌دەنگ » یش ناو نەبراوە .. وەك ساڵانی ١٩٣٦ تا ١٩٤٢ .. جا لەبەر ئەمە دەبێ لە ناونان و سەرباس هەڵبژاردن‌دا وردتر بین بۆ ئەوەی زیاترو باشتر مەبەست بپێکین .

## بیبلیۆگرافیا

بەرزنجی لە کۆتایی کتێبەکەی‌دا بیبلیۆگراکیایێکی بۆ چیرۆکەکانی ئەو « ٤٥ » ساڵە داناوە .. لەم بەشەدا باسی وشەی بیبلیوگرافیا دەکات و بۆ روونکردنەوەی ماناکەشی بەنجە بۆ وتارێکی د. مارف خەزنەوار رادەکێشێ کە لە « رۆژی کوردستان » دا بڵاوکراوەتەوە .. بەڵام دەبوایە ئاگاداری ئەو راستیە بوایە کە مانای ئەو وشەیە لەسەرجەم فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیا ئەورووپایی و تەنانەت رۆژهەڵاتیکانیش‌دا هەیەو بێ‌گومان دکتۆریش بۆ ئەم مەبەستە سوودی لەو سەرچاوانە وەرگرتوە ..

نووسەر ئەم بیبلیۆگرافیایەی بەپێی ساڵی بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکان داناوەو ئەم جۆرەیانی بەلاوە پەسەند بووەو دەڵێ « سەرەتای دەست‌پێکردنی هەموو نووسەرێك ئاشکرایەو ئاشکرایەو قۆناغەکان بەوردی جیادەکرێنەوە .. ل ١٦١ » لەراستی‌دا ئەگەر بەگوێرەی ناوی چیرۆکنووسەکانیش بوایە سەرەتای دەست‌پێکردنی هەر نووسەرێك ئاشکراو دیارتر دەبوو سەرەرای خێرایی دۆزینەوەی هەموو بەرهەمەکانی ساڵانی بێ‌بەرهەمی و وەستانی و هەروەها بەپیتی و فرە بەرهەم بڵاوکردنەوەی .. تەنانەت ژمارەی بەرهەمەکانیشی .. بەڵام ئەم شێوەیە .. گرنگترین **لایەنی سوودبەخشی لەوەدایە کە بە ئاسانی دەتوانرێ سەرژمێری چیرۆکەکانی پێ**

**بکرێ لە هەر ماوەیێکدا کە مەبەستمان بێ .. دەڵێم سەرژمێر .. چونکە تەنیا ژمارەی چیرۆکەکانی تیا دەست دەکەوێو تەنانەت ناوی چیرۆکەکان بەتەواوی نەدراوەتە دەست** .. بۆ نموونە .. ئەگەر کتێبێك کۆمەڵە چیرۆکێکی گرتبێتە خۆیو ئەم چیرۆکانە لەوەوبەر لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاو نەکرابێتەوە .. ئەوا تەنیا ناوی کتێبەکە ( کۆمەڵە چیروکەکە دانراوەو ناوی هیچ چیرۆکێکی دیاری نەکراوە .. ئەوەندە ئەبێ ژمارەی چیرۆکەکانی ئەو کتێبەی نووسیوە .. کە بێگومانم بەلای بەرزنجیوە کاریکی زەحمەت نەبوو ناوەکانی بخستایەتە بیبلیوگرافیاکەیەوە ..

گەرچی بەرزنجی ئەرکێکی گرانی بە بیبلیۆگرافیاکەیەوە کێشاوە .. بەڵام چەندەها چیرۆکی نەگرتۆتە خۆی .. کە هەندێکیان لە لێکۆڵینەوەکەیدا ناویشی هێناونو کاتو ژمارەی ئەو چاپەمەنیا نەشی دەستنیشان کردوە کە تیاندا بڵاوکراونەتەوە..ئەمەیان لەبیرچوونەوەیەو هەندێکی تریشیان لەبەر پەرشو بڵاوی چاپەمەنی کوردی بەسەریدا گوزەریان‌کردوەو لێرەدا تەنیا بۆ نموونە هەندێکیان ناو دەبەم .

چیرۆکی جوان ــ ئەحمەد مەحموود ( ئازاد )
چاپخانەی ژین سلیمانی
تەمەنێکی بەهار ــ ئەمین میرزا کەریم ــ بروا ژ ٨٧
یەفرو ژیلەمۆ ــ ئەمین میرزا کەریم ــ بروا ژ ٦٢
سۆزەی ئازادی ــ حسێن عارف ــ گۆڤاری سلیمانی ١٩٥٩
دڵداری ترسنۆك ــ حسێن عارف ــ روناهی سالی ، ١٦٩٢
مام‌نەریمانو کوڕەکانی ــ محەمەد سالح سەعید ــ دەنگی گیتی تازە ١٩٤٥
زوخاڵ‌فرۆش ــ ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل ــ برایی ( التاخی ) ژ / ٣٢٦ رۆژی ١٠ـ٨ـ٩٦٨
داستانی دوو پاڵەوان ــ رەمزی قەزاز ــ چیرۆکێکی مێژوویی درێژە لەسالی ١٩٦٨دا لەچاپدراوە .
سواڵکەر ــ ئەمین محێدین ــ ژین ژ ١١٤٤
شەوێکی‌گوێژە ــ حامید فەرەج ــ دیاری‌لاوان ١٩٣٤
فرمێسکی وریای داماو ــ عومەر رەشید کەریم ــ ژین رۆژی ٩٦٢/١٢/٢٠

**ماوێتی**

گەنجینەی دەوڵەمەندی ئەدەبی کلاسیکیمان سەرچاوەیەکی زۆر بەرین و فراوانو و بەپیتە ، پشتاوپشت کەلکی لێوەرگیراوەو ، وەرئەگیرێ ... بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە بەپەرۆش و سۆزەوە هەموو کون و قوژبنی ئەپشکینرێ بۆ زیندووکردنەوەی شوێنەواری دێرینی درشەدارمان و بەخشانکردنی گرنگی سوودبەخشی بێ پایانی ... بێ گومان بەم کارە پیرۆزە دەروون گەش و هەست ئارام و چاو ڕوونەو شادی بوون دانەپۆشێ .... لە [ هاوکاری ] ی بەڕێزدا ، ژمارە ــ ٤٢٥ ــ لە ژێر سەرباسی [ لە دوو «خەلیل منەوەر» دۆستەوە بانگەوازێك ] مامۆستا نەریمان وتارێکی نووسیبوو.، تێیدا ماوە و ڕادەی تەقەلاو کۆششی خۆی ، ئنجا هی کاك « هەردەوێڵ کاکەیی » دەرخستبوو ، لە پێناوی کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی بەرهەم و شوێنەواری ــ خەلیل منەوەر ــ شاعری جەماوەری،لە دیوانێکا.. دیارە ئەم هەنگاوە و هەر هەنگاوێ بنری بۆ گەشانەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپوورەکەمان ، گەلێ پیرۆز و بەجێ و بەفەڕە ، دڵسۆزان بە دەروونی فراوانەوە پێشوازی و ئافەرین و پیرۆز بایی لێ ئەکەن و یاریدە پێشکەش ئەکەن ..... گومانی تیا نی‌یە کە شارەزایی لە هەر زار و شێوەیەکدا مەرجێکی زۆر سەرەکی و گرنگە بۆ سەرکەوتنی هەر پرۆژەیەك دەربارەی بەرهەمی هەر نووسەر و شاعر و زانا و ئەدیبێك کە بەو دیالیکتە بەرهەمی هێنابێتە کایەوە .. سەبارەت بە [ دیالیکتی گۆران ] یش ، بە پێویستی ئەزانم لێرەدا ئەم خاڵە گرنگە بخەمە ڕوو : ــ لە میانەی زمانی هۆنراوە و ئاخاوتنی ڕۆژانەدا جیاوازی‌یەکی ئاشکرا هەیە ، ئەم تێبینی‌یەش لە سەرنجی بەرهەمی شاعرەکانی ئەم زار و شێوەیەدا ڕوونو دیارە ....

بێنەوە سەر وتارەکەی دەربارەی بەرهەمی ( خەلیل منەوەر ) ، لەم باسە کورتەدا ، تەنیا لە لایەنی شێوە و داڕشتنی هەندێ وشە و لێکدانەوەیان ئەدوێم کە نووسەر لە چەند دێرە شیعری ( خەلیل منەوەر ) دا خستوونیەتە ڕوو ... ئەوەش لە یاد ناکرێ کە نووسەر هەمیشە پەیڕەوی ڕێنوسی تازە ئەکا ... ( شێخ ڕەزا ) ڕوو ئەکاتە ( خەلیل منەوەر ) و ئەڵێ :

**کاکە خەلیل « گوێ » دەر « وی » گفتارانە**
**« بواچی » پەرێت شون و نشانە**

ئەکرێ لە جیاتی « گوێ » ــ « گوش » بێ ، هەموو

# دەربارەی بەرهەمی «خەلیل منەوەر» و هۆنراوەیەکی «خانای قوبادی».

عوسمان هەورامی

شاعرانی شێوەی گۆرانیش هەر وایان وتووە ، ئاشکرێ لەم بوارەدا « شێخ ڕەزا » بی دەسەلاتتر بێ ... ئەشێ وشـەی « وی » ـ « وەی » بێ ، وشەی « وی » واتایەکی دیکەی هەیە ، کە لێرەدا لەگەڵ واتای هۆنراوەکەدا ناگونجێ ، بەڵام وشەی « وەی » کە بە واتای « بەم » دێ مەبەستی ڕاست و دروست ئەدا بە دەستەوە ... هەروەها وشـەی « بواچی » ئەشێ « بواچوو » بێ ، « بواچی : بڵێی » ـ « بواچوو : : بڵێم »

جا با واتای تاکەکە لێك بدەینەوە تا زوتر بۆمان ساخ بێتەوە : [ کاك خەلیل ، گوێ بگرە ، با شوێن و ناو و نیشانی خۆتت بۆ هەڵ دەم ... ] وا ئە ئەشێ ئەم تاکە بەم جۆرە بێ :

**کاك خەلیل « گۆش » دەر « وەی » گفتارانە**
**« بواچوو » پەرێت شونو نیشانە**

لە هۆنراوەی دیالیکتی گۆرانیشا ، بۆ بەکارهێنانی وشەی « گۆش » لە جیاتی « گوێ » ئەم چەند نموونەیە ئەخەمە بەر چاو : ـ

وەلی دێوانە ئەڵێ :

**ئەی « گۆش » ئەژنەوا و هەر یەکجار کەڕبای**
**ئەی کەڕ وە غەزەب باد صەرصەر بای (۱)**

[ بای مەولەوی : ببی ]

**دینت تۆشەی چەم مەیلت تۆشەی دڵ**
**ڕازت تۆشەی « گۆش » مەنزل وە مەنزل (۲)**

[ دینت : دیدارت ]

سەیدی هەورامی :

**« گۆشم » هەر چە دەنگ وەشیی نی سازەن**
**وەشەن ساز عەشق سەدکە مەجازەن (۳)**

[ وەشەن : خۆشە ـ سەدکە : هەرچەندە ]

میرزا عبدالقادری پاوە :

**چەنی مەی نۆشان مەدهۆشم ئیمشەو**
**دەنگ قلبەمەن نە « گۆشم » ئیمشەو (٤)**

سەید صالحی کرماشاتی :

**تا کەسێ دڵەی چوون حوەم نەی وە جۆش**
**هەلقەی بەندەگی عەشق نەکەی وە « گۆش » (٥)**

بێینەوە سەر هۆنراوەکەی « شێخ ڕەزا » کە ئەڵێ :

**مەواچە ڕەزا « خەیاڵەش » « خاوەن »**
**شیعر و « گوفتارەش » قسەش بێ تامەن**

[ مەواچە : مەڵی ]

لە شێوەی گۆرانا لە جیاتی [خەیاڵەش گوفتارەش] ئەوترێ [ خەیالش ، گفتارش ] ، وا ئە بزوێنی دوای [ خەیاڵ ، گفتار ] ، کە بنچینەی هەردوو وشەکەن ، زیادەیە ... هەروەها وشەی [ خاوەن ] لەگەڵ [ بێ تامەن ] ناگونجێ و تاکەکە لەنگ ئەبێ ، جا ئەکرێ لە جیاتی [ خاوەن ] [ خامەز ] بێ ، بە واتای [ بێ چێژ ، بێ واتا ، پو وچەڵ ] تێکرای واتای تاکەکەش بەم چەشنەیە : [ مەڵێ خەیاڵی ڕەزا پووچەڵ و بێ سەرو بنەو ، شیعر و گفتاری هیچ و پووچن ... ]

لەم تاکەی خەلیل منەوەریشا :

**ڕەزا علەت بو « ای » « حورفە » وەسەن**
**« حرفی » نادروست پەرێ کەس وەشەن**

ئەبێ وشەی « ای » ـ « ئەی ، ئی » بێ ، بە واتای « ئەم » ، ئەشکرێ « حورقە » ـ « حەرقە »

بێ ، دووریش نی‌یە ئەم هەڵە بچووکانە هەڵەی چاپ بن ...

لەم تاکەشا :

**« کەرێش » وە مەکتەب پەرێ ئەطفالان**
**« دەرۆم » « تەعلیم شان » « فرێ » وە ڕەوان**

ئەشێ لە جیاتی « کەرێش » ــ بێ ، بە واتای « بیکەی » ، ئەکرێ ئەم هەڵەیەش هی چاپ بێ ... لە جیاتی « دەرۆم » ئەبێ « دەرووم » یا « دەروون » بێ ... [ دەرۆم : بمداتێ ] ــ [ دەرووم ، دەروون : بدەم ] ... لەبەر ئەوەی « تەعلیم شان » یەك وشەیە ، ئەبێ بەم چەشنە بنووسرێ : « تەعلیمشان »، واتە [ تەعلیمیان ــ فێرکردنیان ] لەگەڵ سەرنجی ئەوەدا کە ناکرێ بنووسین « تەعلیم یان » .. هەروەها لە جیاتی « فرێ » ئەبێ « فرە » بێ ، بە واتای « زۆر » ... لە ئەنجامی ئەم چەند کورتە سەرنجانەدا بۆمان دەرئەکەوێ ، ئەگەرچی « مامۆستا نەریمان » تا ڕادەیەك شێوەی گۆران بزانێ، بەڵام وەك هەورامی‌زان و پسپوری شارەزاو ئاگاداری ئەم دیالێکتە نی‌یە و ، ئەگەر هۆنراوەکانی شێوەی گۆران بەم چەشنە تۆمار بکرێن و بخرێنە بەرچاوی خوێنەران ، وا دووبارە پێاچوونەوە و بژاریان ئەوێ ، بە تایبەتی لایەنی ڕێنووس و لێکدانەوە و ساخکردنەوە ... واتە لە جیاتی قۆناخێ ، ئەوسا پێویستیمان بە دوو قۆناخ و پتریش ئەبێ ...

دەربارەی وشەی [ منەوەر ] و ساخکردنەوەی ... ، دیارە برای نووسەر وای بۆ چووە کە نازناوی شاعرە و بە واتای « ڕۆشنبیر » هاتووە ، هەر وەکو نووسیویەتی [ وەك ڕۆشنبیر ( منەوەر )ێك باوەڕی بەوە بووە کە پێویستە هەموو کەس فێری خوێندن و نووسین ببن ... ]

بۆ هەمان وشە لە [ مام حاتەمی هاواری ] م پرسی ، کە تەمەنی [ ۹۰ ــ نەوەد ] ساڵە و چەندان جار بە سەردان بە هەموو ناوچەکانی کاکەییدا گەڕاوە، لە وەڵاما وتی [ بۆ خۆم بە دیداری سەید خەلیل منەوەر شاد بووم ، چاویشم بە دایکی کەوتووە ، ناوی ــ منەوەر ــ بوو ، زۆر بلیمەت و زیرەك بوو ، هەروەها لە کاروباری ژیان و پزیشکیشا دەستێکی باڵای هەبوو ، بە ڕادەیەکی و ناوبانگی دەرکردبوو ، کە خەڵکی ناوچەش ناوی سەید خەلیلیان لکاندبوو بە ناوی دایکیەوە و پێیان ئەوت سەید خەلیل منەوەر .. ] ..

بۆ هەمان ڕوونکردنەوەش « مامۆستا مەلا عەلی سەنجەری » ئەڵێ ، کە خێزانە خوا لێ خۆشبووەکەی لەسەردەمی لاوێتیدا « دراوسێی دادە منەوەر » بووە و ، ئەویش ، وەکو « مام حاتەم » ئەم باسەی کردووە ......

ئەوی شایانی باسە ، لەو ناوچەیەدا کە « سەید خەلیل منەوەر » ی تیا ژیاوە ، ئافرەتی « منەوەر » ناو زۆرن ، لەسەرێکی کەشەوە ئەوە ئەخەینەوە یاد کە لە ناو کوردەواریدا باوبووە و ئێستاش باوە ، کە ناوی زۆر کەس لەگەڵ ناوی دایکیانا هاتووە و دێ ..

لە کۆتاییی ئەم سەرنجانەی دەربارەی بەرهەمی « خەلیل منەوەر » و ، لە ڕوانگەی گیانی هاوکاری و دڵسۆزی و یاریدەوە ، وەکو شارەزایەك ــ تا ڕادەیەك ــ لە دیالێکتی هەورامی ، وا منیش بە پێی توانام ئامادەیی خۆم پیشان ئەدەم بۆ پیاچوونەوە و ساخکردنەوە و لێکدانەوەی وشە و هۆنراوەکانی شێوەی گۆران لە دیوانی ــ خەلیل منەوەر ــ دا ..

دەربارەی هۆنراوەکەی شاعری بە توانا [ خانای قوبادی ] ، کە کاك [ کەمال نووری مەعرووف ] لە هەمان ژمارەی ــ ٤٢٥ ــ ی [ هاوکاری ] ی بەڕێزا بڵاوی کردبۆوە ، ئەڵێم ، لەبەر نەزانینی شێوەی گۆران و بێ نەزانینی ڕاستی هەندێ وشە و ، جا ڕاستکردنەوەیان ، لە خوێندنەوە و « ڕوونووسکردنی » بەرهەمەکەدا ، ئەم برایە تووشی هەندێ هەڵەی ڕێنووس و تێکچوونی زۆر وشە بووە ...

سەرەتای هۆنراوەکە لە دەسنووسی بەڕێز [ نووری سەعید ئاغا ] دا « کە کاك کەمال هۆنراوەکەی لێ وەرگرتووە و ناوی نەبردووە» ، لە لاپەڕە ٣٢٦ ــ دا بەم دووتاکە دەست پێ ئەکات :

**ئەر هەی بلند ماڵ ، ..........**
**ئەر هەی یانە بەرز بەنای بلند ماڵ**
**ئەرێ مایە نوور صوبح زەڕین باڵ**
**ئەرێ ئاگاهدار هەم حاڵزان حاڵ**

کەچی کاکی نووسەر لە جیاتی [ ئەر هەی ] لە یەکەم دێڕی سەرەتادا و لە هەردوو شوێنەکەدا وشە [ ئەرێ ] ی داناوە ! ..

کۆتاییی هۆنراوەکەش لە لاپەڕە ــ ٣٢٧ ــ دایە و بەم دوو تاکەیە :

**حەڤ بە دەست تۆن شای ئەزا و ئەمەرد**
**ئەکێشانت جەور جەفا و داغ و دەرد**

**وه ڕەنجەڕۆیی و وه نامرادی**
**نەیاوا وه کام خانەی قوبادی**

[ نەکێشانت . نەتکێشاوه ــ نەیاوا : نەگەیشت ] .. لەگەڵ سەرنجی ئەوەشا که « خانا » ڕاستتره ، نەك « خانه » .....

ئەوی جێی سەرسوڕمانه نووسەر هۆنراوەکەی بە چوار دێڕ هۆنراوەی [ بەندی دووەم ] ی [ حەوت بەندی خانای قوبادی ] (٦) سەرمۆر کردووه ، ئەمەش دوا تاکی هۆنراوەکەیه ، وەك کاکی نووسەر بڵاوی کردۆتەوه :

**وەرته بە ذاتت جه لای ذات تو**
**« مەکەردن » روی حەشر من شکاتی تو**

[ وەرته : ئەگینا ــ جه : له ] [ مەکەردن : نەیانکرد ، ئەمەش هەڵەیه و ڕاستیی‌یەکەی ــ مەکەروون ــ ه ، بە واتای ــ ئەکەم ــ ] ڕاستتریش وایه بنووسرێ [ شکات تو ] نەك [ شکاتی تو ] شایانی باسه ، که تاکی ناوبراو کۆتاییی هەر بەندێکه له [ حەوت بەندی خانای قوبادی ] ....

لێرەدا پرسیارێك دێته پێشەوه : بۆچی نووسەر ئەم چوار دێڕەی کردووه بە کۆتاییی هۆنراوەکه و ، لە هەمان کاتیشا هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە سەرەتا و ناوەڕۆکو و کۆتاییی‌یەوه نی‌یەو ، بەشێکیش نین لە هۆنراوەکه ؟ !

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە ئەسڵی هۆنراوەکه ، ( ٤٤ ــ چل و چوار دێڕه ) ، بە ڕیز و زنجیره تا دێڕی بیست و سێیەمینی نووسیوەتەوه ، جا چوار دێڕی ناوبراوی سەرەوەی کردووه بە کۆتایی و، بەم چەشنته هۆنراوەکەی کردووه بە ( ٢٧ ) بیست و حەوت دێڕ . !

**ئێستاش نۆرەی دەستنیشانکردنی ئەو هەڵانەیە، که کاکی نووسەر ڕوونووسی کردوون ، یا گۆڕیونی ، لەگەڵ بۆچووتی ڕاستکردنەوەیانا :**

له سەرەتای یەکەم دێڕا ــ وەك باس‌کرا ــ لەجیاتی ( ئەرهەی ) نووسراوه ( ئەرێ ) ...

له دێڕی ( ٥ ــ ٦ ــ ٧ ــ ١٠ ) دا ، هەمان هەڵەی پێشوو دووباره کراوەتەوه ...

له دێڕی پێنجەما ، ڕاستیی وشەی ( ئەهانی ) ( نیهانی ) یه ، بە واتای ( نادیار ) ...

هەر دوو دوا وشەی دێڕی حەوتەم ( عەیانەك ــ جهانەك ) که واتایەکیان نی‌یه ، ڕاستی‌یەکەیان ( عەیانکەر ــ جهانکەر ) ه ....

له دێڕی نۆیەما ، وشەی ( مەنشەی ) واتایەکی ڕوونی نی‌یه ، ڕاستی‌یەکەی وشەی ( مونشی ــ منشیء ) ه ، یه واتای ( نووسەر ، دروستکەر ، دانەر )

له دێڕی یانزه هەما لەجیاتی ( کرد ) ( کەرد ) دروستترەو گۆرانیش وا ئەڵێن ...

له دێڕی دوانزەهەمیشا لەجیاتی ( صافتر ) ( صافتەر ) دروستتره ...

له دێڕی سیانزه هەما ، راستی وشەی ( ئاورو ) که واتایەکی ڕوونی نی‌یه ، ( ئەو ڕۆ ) یه ، بە واتای ( ئەو ڕۆژەی ) ...

له دێڕی چواردەهەما ، وشەی ( بەیچوون ) واتای نی‌یه ، ڕاستی‌یەکەی ( بێچوون ــ بێ‌چوون )ه ، یه واتای بێ وێنه ، هەر خواش بێ وێنەیەو کەس له ڕەنگی نی‌یه ...

له دێڕی شانزەهەما ، وشەی ( بێزار ) ــ هەر چەندە له دەستنوو سەکاشا هەر وا نووسراوه ــ ڕاستی‌یەکەی ( بێدار ) ه ، بە واتای ( ئاگادار ، وریا ، هوشیار ، یەخەبەر ) ، وشەی ( لەفظه ) ش بەم چەشنەیه ( لەفظ ) ... وشەی ( لا ) ــ وەك له دەستنووسەکەشا نووسراوه ــ ڕاستی‌یەکەی ( بلی ) یه ، جا یا سەرنجی ئەم تاکه بدەین ــ وەك کاکی نووسەر تۆماری کردووه ــ لەگەڵ بۆچوونی ڕاستکردنەوەیا

**چون خاطر وه ذات شاه اقدم بیم**
**دڵ ( بیزار ) چه ( لفظه ) و نعم بیم**

ئەگەر بنووسرێ ( بێزار ــ لا ) بەجاری واتای هۆنراوەکه ئاوەژووئەبێ ، ئەوەتا له دوو تاکی پێشتریشا باش ڕوونی ئەکاتەوه ، که وەڵامی یەزدانی پاکی بە وشەی ( بلی ) بووه ، نەك ، خوانەخاسته ، بە ( نعم ) یا ( لا ) ...

**به ذات بێ‌چوون بێ شوبه و مثال**
**( بلی ) م وات جەواب ذات ( ذا الجلال )**
**عالمی ئەقدەس حەیی تەوانا**
**( بلی ) بی جەواب قەییووصی دانا**

لەم سەرنجەدا بۆمان ڕوون بووەوه ، که ئەشێ تاکی ڕابوردوو بەم چەشنه بێ :

**چوون خاطر وه ذات شاه ئەقدەم بیم**
**دڵ ( بێدار ) چه ( لەفظ ) ( بلی ) و نعم بیم**

بە واتای [ چونکه له ئەزەلا دڵ و هەست و هۆشم لای زاتی یەزدانی مەزن بوو ، له عاستی وشەی

( بلی ) و ( نعم ) دا ، دلم هوشیار و بەئاگا بور ] ...
بێ گومان ئەمەش ئاماژەیە « ئیشارەتە » بەم ئایـــە تەپیرۆزە [ ...... الست بربكم قالوا[1] بلى ......
ـ سوورەتی الاعراف . ئایەتی ژمارە ـ ١٧٢ ]

لە دێڕی حەڤدەهەما وشەی ( غەز ) هیــچ واتایەکی نی‌یە ، ڕاستی‌یەکەی ( ئەمز ) ە ، یە واتای ( نەمزانی ، نازانم ) ، ڕاستیی وشەی ( بەخش ) یش وشەی ( چێش ) ە ، یە واتای ( چی )

دێڕی هەژدەهەم بەم چەشنە نووسراوە :

**« ئاور وە رەها » بیم چە یطن مادر**
**« امام » وە « صەفەر » دنیای « پر » خەطەر**

گومانی تیا نی‌یە کە « ئاور وە رەها » هیــچ واتایەکی نی‌یە ، بەم چەشنە ئەم تاکە تەواو شێواوە ، ڕاستیی ئەم تاکە بەم جۆرەیە :

**( ئەو ڕۆڕەها ) بیم جە بەطن مادەر**
**ئامام وە سەفەر دنیای پەڕ خەتەر**

[ ئەو ڕۆ : ئەو ڕۆژەی ـ ڕەها بیم : پەیـــدا بووم ، لە دایك بووم ـ ئامام : هاتم ] ... تێکڕای واتاکەش بەم چەشنەیە :

[ لەو ڕۆژەوە لە دایك بووم و کاروانی ژیانی سەختو نالەبار و شێواوم کەوتە بەر ... ]

لە دێڕی نۆزدەهەما ، نووسراوە ( چێش‌یا ) ڕاستی‌یەکەی ( چێش یـی ) ، هەروەهـــا ڕاستیی ( بێ سوود ) ، وەك لە دەسنوو سەکەشا نووسراوە ، ( بێ شۆ ) یە ، بە واتای ( لە ڕادە بەدەر ، بێ ئەندازە ) ... بەم چەشنەش سەروای تاکەکە ئەگونجێ ....

لە دێڕی بیست و یەکەما ، ڕاستیی هەردوو وشەی [ بیبری ـ نوغامان ] بەم چەشنەیە [ بێ بەری ـ نەونەمامان ] ....

لە دێڕی بیست و سێیەمدا ، نووسراوە ( بام چەنگ ) ، کە واتایەك نادا بە دەستەوە ، ڕاستی‌یەکەی ( هام جەنگ ) ە ...

لەم باسەشا ، بە پێی توانا و شارەزاییم ، تەنیا مەبەستم ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە و ساخکردنەوەی ڕەسەن و بناوانی وشەی کوردی‌یە ....

لەگەڵ ڕێزو هیوای سەرکەوتنا بۆ نووسەرانی هەردوو باس و بە دەستهێنانی ئامانجی پیرۆزتر لە پێنـــاوی پاراســـتن و زیتـــدووکـــردنـــەوەی کەلەپوورەکەمانا ....

## پەراوێزەکان :

(١) عوسمان هەورامی ، ژیان و بەسەرهـــات و هۆنراوەی وەلی دێوانە ، چاپی کۆڕی زانیاری کورد ، ١٩٧٦ ، ل ٢٧ ...
(٢) مەلا عبد الكريمى مدرس ، دیوانی مەولەوی ، ١٩٦١ ، ل ٦ ...
(٣) عوسمان هەورامی ، دیوانی صەیدیی هەورامی، ١٩٧٠ ، ل ٩٢ .
(٤ـ٥) دەسنووسی خۆم .
(٦) محمد علی قەرەداخی ، بەیان ، ژمارە (٢٨)ی ئابی ١٩٧٥ ، ل ٣٠ ....

له ناوبردنی نەخوێندەواری مرۆڤ له
کۆتی دواکەوتن و نەزانین ڕزگار
دەکات .

# (دارستانی ئەوبنارە) گۆرانی شاعیرێکی خەمناکە لە نێوان سیزیف و زۆربادا

دلشاد محمد امین

کاتێك بەدیوانەکەی نەوزاد رەفعەتدا دەچوومەوە ، وەك هەموو جار ویستم ئەو دێرانە بدۆزمەوە کە لە نێوانیاندا شاعیر خودی خۆی پەنا داوە . بەومەبەستەی بزانم شاعیر کێ‌یەو چۆن دەڕوانێتە خۆری‌و ژیانی ئێستای

**خۆم بێ چەنزم ....**
**خۆم بێ سێبەرو بێ کەپرم .... ( ل٤٢ )**
**( کێ کەرتێکی شاخی کۆلی من هەل دەگرێ ؟**
**تا بزانێ باری ئەم کۆستەچەند قورسە ؟ ) (ل٤٤)**

★ ★ ★

**ڕێگاکان کوان ؟**
**تەم دایگرتوون ؟ ! یاسووتاوون ؟ !**
**گولەکان کوان ؟ ! ( ل ٤٤ )**
**تا بزانێ بۆ ڕۆ دەچم ! هەل دەستمەوە**
**دەبمە دەریاو هەل دەچم ؟ ! ( ل٤٥ )**

خۆم بەرامبەر شاعیرێکی لاوی خەمناکی تازەچرۆبینی‌یەوە ، ئەم شاعیرە لە نێوان ئاوازو ئیقاعی خەمناکی دێرەکانی‌یەوە گۆرانی‌یەکی دەووت بۆ تێکشکان . ئەوی‌ڕاستی‌بێ . ویستم واز لە پێدا چوونەوەو هەلسەنگاندنی بهێنم . چونکە لە مێژەوە وەڕسم لەو شاعیرانەی خەم دەفرۆشن . لە مێژەوە بە دووی شاعیرانێکدا وێلم ڕابەری ڕاستەقینەبن‌و لە هەموو تێکشکانێکدا ئەوان خەلکی هەل بستێننەوە نەك بە پێچەوانەوە . چونکە لای من مەزنترین حورمەت‌و ڕێز گەر بدرێ بە یەکێك .. ئەوەیە پێی بووترێ ( شاعیر ) تەنیا ئەم ووشەیە زۆرە ئیتر با تۆ هەزارو یەك تێ‌بینیت دەربارەی هەبێ .. گرنگ نی‌یە . گرنگ ئەوەیە تا لەبەرەی خێردا نەی‌بینی وای پێ نالێیت . دەبا ئەویش وەك نیشان بیکا بە سنگی‌یەوە . بەلێ ـ ویستم واز لە پرۆژەکەم بێنم . بەلام من پێشترو لە میانەی سالی حەفتاوە تا ئێستا لەناو ئەو هەموو لاوانەدا کە شیعر دەنووسن‌و ژمارەیان لەچەند سەدێك زیاترە . تەنیا ٥ـ٦ لاووم هەلژاردووە سۆراخی بەرهەمەکانیان بپرسم‌و گرنگی‌یان پێ‌بدەم بە ئومێدی ئەوەی لەناو بەرهەمی ئەمانەدائەو تروسکایی‌یەی بەدیم کردووەوا دەشێ بیانکاتە خاوەن پلەو پایەی خۆیان لە ئەدەبی هاتووی کورددا . دیارەنەوزاد یەکێکە لەو ٥ـ٦ لاوە .

بۆیە جارێکی‌تریش بە دارستانەکە نەوزاددا چوومەوە . گەرچی بەروبوومی زۆر سادەو کال‌و میتافیزیکی‌یانەی وەهام دی .

**خۆمان شوومین یالە هەنیەمان نوسراوە :**
**دەبێ تاماوین غاردەین‌و نەگەینە ژێر ئەو ئاسمانە ؟؟**
**نەگەینە ئەو دارستانە ؟؟ دەوری ئاگردانێك نەدەین ؟؟**
**دەبێ تاماوین غاردەین‌و نەگەینە پەنایەك بەفرو کڕیوە نەیگرێنەوە**

بەلام لەگەل ئەوانەش‌دا کە بەرهەمی چەند ساتێکی وورە بەردانەو شاعیری پێ تەرا زوو ناکرێ‌و شاعیریش وەك هەر مرۆڤێ بۆی هەیە خەمناك‌بێ . بە مەرجێ خەمەکەی گەر لە بەرهەمەکانی‌دا ڕەنگی دایەوە کوشندەو وورە پێ‌بەردەر نەبن . جەماوەر ڕووخێنەر نەبن . زۆر تەجریدی‌و زاتی نەبن کە هیچ جۆرێ پەیوەندیان بە کۆمەلەوە قرتابێ . هەر وایش بوو زانەکەم بەرامبەر نەوزاد باش دەرچوو .. چونکە خەمە زاتی‌یەکانیشی هەر بەستراوەن بە کۆمەل‌و خاکەکەیەوە تەجریدی نین ـ بۆیە هەناسەیەکم پێدا هاتەوە .

**من کە لوورەی باوبۆرانو سەگی ئاوایی دەبیستم**
**دادەخورپێم . مەلوول دەبم**
**دەڵێم ئاخۆ دەبێ کام دلدار بمری ؟**
**دەبێ دەستم کامە خۆشەویست بنێژێ ؟**
**دەڵێم دیسان ئەستێرەم کەوتۆتە لێژی**
**کۆستێك پشتم دەشکێنێ ( ل ١٧ )**

نەوزاد دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی خەمەکەی تاکو تەنیا بۆ کەسی خۆی نی‌یە. مردنی خۆشەویستێ .. کۆستێکی گەورەیەو پشتی دەشکێنێ . وەك هەندێ لە شاعیرانی زۆر زاتی واوەیلای لە دەست تێداچوونی خۆی نی‌یە . بەرەو ڕووبوونەوەی لەگەڵ مەرگ‌داو مامەڵەکردنی لە تەك لەناوچوونو ژیان کوزاندنەوەدا لەو گۆشەیەوە دەگرێتەبەر کە مەرگی خۆی ئاسایی‌یە بەڵام دڵ دا خورپانەکەی بۆ مەرگی دلدارێکە خۆی‌و پەنجەکانی بەشداربن لە ناشتنی‌دا .

ئەم مامەڵە کردنەی بردمی بەرەو تاوتوێ‌کردنێکی ووردی دیمەنو دەربڕینو ئەندێشەکانی .

ئەم لاوە خەمناکە لە نێوان سیزیفی‌یەتو زۆربایی‌یەت‌دا لە ملانێدایە . لە کێشەیەکی توندو تیژدا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەم ڕۆڵەی ئەم خاکو کۆمەڵەیەو بە هەزارەها گوریس ڕەنگی پێستو نەبرەی دەنگ‌و تروسکەی چاوی‌و سۆزی ناخی‌و بیری مێشکی بەستراوەتەوە بەم خاکەوە . بۆی ڕوون دەبێتەوە ئەم نابێ خۆی بخەڵەتێنێ‌و لاسایی خەشخاش‌و تریاك خۆرو بەنگ کێشەکانی وولاتانی سەرمایەداری بکاتەوە .. بۆیە .. لە ئەنجام‌دا زۆربا ڕەت دەکاتەوەو لای سیزیف خۆی دەبینێتەوە .

لە سەرەتادا مەیلی زۆربایی‌یەتی هەیەو خۆی تاقی‌دەکاتەوە .

**شەو درەنگەو شەقامەکان کپن.چۆڵن منیش خەمبارم**
**دەخەڵسە**
**بکەوە گۆرانی‌و بەزمو هەموو وەڕسی‌و خەمەکان**
**بەسەمایەك بە با بدە دەسەمتوورەکەت هەڵگرەو**
**سەرچۆپی بە پەنجە شێتەکانت بگرە**
**با ئەو ئەسپەی هاتۆتە سەر پاشوو بەهەر دوو لەپ**
**بەربۆتە دەروازەی مێشکت بەرەڵا بێ‌و بەناو شارە**
**گەمژەکەتا**
**غار بداتو بحیلێنێ باشەختەی ڕووی گوڵی**
**بیرکردنەوەت بشکێ . ل (١٦-١٧)**

بەڵام دەزنانی ئەم تاقیکردنەوەیەی .. بۆ سەرناگرێ . چونکە وەك زۆربایەك مۆڵەتی ئەوەی نی‌یە سەمتوور لێبداو سەمابکا . ئەو شارەیش کە تیای‌دا دەژی وەك شارەکەی زۆربا خاوەنی شەوی بێ وەی نی‌یە . هەست بەوە دەکا تەنانەت کۆمەڵە ئافرەتانێکی دەوروبەری خاوەنی باخەڵی سەربەستی خۆیان نین وەك ئافرەتەکانی شاری زۆربا .. بەڵکە هەریەکەیان بەرامبەر مێردێکی ڕۆژهەڵاتی خاوەن ئیلتزامن . جگە لەمانە دەزانێ خۆیشی وەك لاوێکی خەمناکی ئەم کۆڕو کۆمەڵە .. خاوەنی ئەو بیروباوەڕە نی‌یە لە پێك‌دا خەمەکانی بنووێنێ . چونکە خۆی لاوێکی کوردەو ئێرە کوردستانی عێراقەو کۆمەڵەکەیشی کوردەواری‌یە ..... بۆیە .

**پێکێك هەڵدەم ؟ بکەومە گۆرانی‌و بەزمو**
**هەموو وەڕسی‌و خەمەکان بەسەمایەك بەبا بدەم ؟**
**ئەی زۆربانی ؟**

خێرا هوشیار دەبێتەوەو دەڵێ : نەخێر من نەوزاد ڕەفعەتم و ناتوانم زۆربابم .. چونکە .

**زۆربا شاخێك بیرەوەری‌و کارەسات دەگوێزێتەوە**
**زۆربا هەموو شەوێك خۆی لە بێشەی قژێکدا**
**دەکوژێ‌و**
**بەیانیش هەڵدەستێتەوە . ( ل ٢٠ )**

شاعیر لە هوشیاری‌یەوە زۆربا ڕەت دەکاتەوەو وەدەزانی لەم کۆمەڵەی خۆیدا لەسەر بێشەی قژێك سەد زۆربا دەکوژێ‌و هەرگیز هەڵناسێتەوە وەك‌خۆی . بۆیە ڕوو دەکاتە خۆشەویستەکەی .

**دەزانی بۆ لە دێرەوە کۆستی تۆم بە کۆڵەوەیەو**
**تلە بەردی ئازارەکانت هەڵدەگرم . (ل ١١)**

وەك بڵێ دەزانی ناتوانم زۆربابم . من سیزیفم‌و تاشە بەردی کۆستی نەگەیین بە تۆم بە کۆڵەوەیە . لەهەموو سەرخستنێك‌دا لێم دەخزێتەوە لەسەری لوتکەوە بۆ بنار دیسانەوە وەك سیزیف لە چارە نووسراوە لێی بتەوەمەوەو دیسانەوە بگرمەوە بەشانمەوە .. چونکە بۆتە قەدەرم

**من پێشوەی چاو بەدنیادا هەڵهێنم**
**دلدارت بووم . (ل ١٢)**

گەرچی ئەم خۆش‌ویستنە میتافیزیکی‌یانەیە . کارەساتەکەی شێخ ئەرخمان دێنێتەوە یاد کە لە شیعرێکی شێرکۆ بێ‌کەس‌دا لە پاشکۆ شیعری‌یەکەی ڕۆژی کوردستان‌دا بلاوکرابووەوە . وە ئەوەمان‌پێ‌ی دەڵێ : گوایە خۆشەویستی‌یەکە لە چارە نووسراوەو لە پلەی قەدەردایە . بەڵام تروسکەیەکی ووریایانەمان پێ دەبەخشێ کە نەبوونی‌و چەوساندنەوەیش دادەنێ

بە هۆیەکی گرنـــك بۆ لێـــك نزیك بوونەوەیـــانو گەیشتنی‌یان بە یەك .

**منو تۆ ئەو شەوە فێری عیشقی خاڵەو**
**ماڵو دەواری خۆمان بووین کە تا بەیان**
**لەدە شتەکاندا ماینەوەو باران لێی داین . (ل ١٠)**

دیارە ئەم خۆشـەویستی‌یەی لە چەوساندنەوەدا لە دایك دەبێ . ئەو دوو دلدارەی نەبوونی یەکیان دەخا. هەر شتێکیان چنگ بکـــەوێ بــــۆ خزمەتـــــی دلداری‌یەکەیانی دەخەنە کار .

**گەر ئەو خەرتەلەی دەبینی بەسەرمانەوە دەگەڕێ**
**بێو باڵەکانیم بداتێ تەنیا ڕووەو تۆ هەڵ دەفڕم**
**گەر ئەو خۆرە ڕۆشنایی‌یەکەیم پێ ببەخشێ**
**من شوێن پێی تۆی پێ هەڵدەگرم . (ل ١٣)**

تەنانەت گەر خۆر بەرپێی ڕوناك بکاتەوە ئەم خزمەتی شوێن پێ ـ هەلگرتنی دلدارەکەیدا بەکاری دێنێ . لێرەدا خۆر وەك لای زۆر شاعیر مەبەستەو ڕەمـــزە بۆ سەربەستی . لای نەبزاد تەنیا هۆیەو بەکاردێ بۆ مەبەستێکی ڕۆمانتیکی‌تر کـــە ئەویش شوێن پـــێ هەلگرتنـــی دەستگیرانـــە بۆگەیـــین پێی . وەك هەستبەوە بکا کە گوایە ئێمە گلەیی لێدەکەیـــنو دەڵێین چۆن دەستگیران لە خۆر مەزنترە ؟ . ئایا ئەم باری‌بەچی‌یە بەڕەمزی دەکەی ؟ بۆ هەوڵ نادەی باشتر لە ڕەمز بگەن تاتووشی دژواری نەبی ؟ وەك بەمــــەی زانیبێ هەڵدەداتێو باسی خۆشەویستی‌یەکەی دەکـا تا پێمان بلێ ناهەقم نی‌یە . گەرچـــی ئێمە بــــەم ڕۆمانتیکی‌یەتە قایل نابینو دەڵێین ئەی شاعیرەکـــە وورە بەرمەدەو ووردتر بە . ڕۆژێـــك‌دەیکەیتێ . پێویست ناکا

**دەگریم گەر بزانم گریان چەند ڕۆژێك دەتهێنێتەوە**
**خۆم دەکوژم گەر بزانم مەرگم زێیەو**
**تریفەی مانگو ساماڵی تیا دەبینیو**
**تێوران قژی پێدەشۆی . ( ل ٤٨ )**

شاعیر گەر بەم ناسکیو گۆرانی گـەری‌یـــەوە ناوەستێ بەڵکە زیاتر تۆخی دەکاتـــەوەو سیفەتـــی موتلەقی دەداتێ .

**دەمباتەوە نامباتەوە لای من هەر تۆی ...**
**تاقە ڕووباری داوێن‌پاك ، ئەو ڕوبارەی خاك لافی پێوە**
**لێدەدا ئەو ڕوبارەی مرۆف چۆکی بۆ دادەدا . (ل٤٩)**

ئەم ڕووانینە سۆفی‌گـەری‌یانەیـــە بۆ دلدارو دەستگیران وخۆشەویست ..... ڕامـــان دەگرێو هەست بە مەترسی دەکەین لەسەر شاعیر . چونکە هەر ڕووانینێك زانستی‌یانەو مەوزووعی‌یانە نەبـــێ جێی مەترسی‌یەو زۆر جـار ئەنجامێك دەدا بـــە دەستەوە پێچەوانەی ئەو خواستو مەبەستەی شاعیر خۆیشی ویستوویێتی نەك ئەمە بەڵکە گەێ جار شاعیر گەر بشلێ

**پێم ئەووتی : لانەوازو بێ پەنایشبی**
**جلەوی ئەسپی خان نەگری ؟**
**ئەم ووت : ئەم خانە خۆش خوانێك ڕاناگرێ**
**بەیتو باوی ئەوین بڵێو عاشقەکانی هەموو وولات**
**دوای خۆی بخات ؟ ( ل ٧ )**

بەڵێ .. گەر وایش بلێ .. هێشتا دووشکەو گومان لەهەموو شت دەکا تەنانەت لە خــۆی کـــە هێندەی خەیاڵە فراوانەکەی پاك نەبێ . بۆیە :

**دەترسم تۆیش دابێتەوە**

ئەوە ترسی‌یەکەمێتی بۆ تەسلیم بوون . ترسی دووەمیشی هەیە بۆ خۆ لەناوبردن نەك بەرگە نەگرێ . دیارە ئەمەیشیان گۆڕەپان چۆڵ کردنو خۆڕانەگرتنە لەبەردەم کێشەکاندا .. واتە جۆرێکی ترە لەتەسلیم بوون

**دەترسم تۆیش دابێتەوە**
**یا خۆت لەشاخی بەرزەوە**
**هەلدێریتو نەتبینمەوە ( ل ١٦ )**

گەر ئەو خەیاڵاتانە لە لایەن شاعیرەوە دژایەتـی لەگەڵدا نەکرێو هەوڵ نەدا بە نەئاســـەنەیەکـــی پێشکەوتووخوازی مرۆڤ‌ویستانە بەرپەرچی لێبکا . کاتێ بەخۆی دەزانێ بووە بە بینەرێكو هیچی تر . کاتێ دەزانێ لە هەناسە هەڵکێشانو ئاخو ئۆف زیاتر هیچی تری بۆ نەماوەتەوە

**دەچمەوە پشت شووشەی پەنجەرەی**
**بەر کزە باو ڕادەمێنم**
**دەڕوواتمە دوور ( ل ١٤ )**

ئەم ڕووانینە دوورە بێهوودەو ســـاردە .. گەرمیو شۆڕشگێڕیو گیانی بەردەوام بوون لـــــە گۆڕینو پێشکەوتن‌دا دەکوژێ .

لەو جۆرە ڕووانینە میتافیزیکـی‌یانەدا هیـــچ چەشنە ئومێدێکی ئینسانی‌ی شیاو بۆ سەردەمو ئانو سەعاتی کێشەکە بەدی ناکرێ جگە لە وورێنەو خـۆ دوواندنو وورە بەردانو خۆ ڕووخاندنو خۆدانـــە دەست ( نادیار ) . کە ئەمە خۆی لە خۆی‌دا وورە

بەردان‌و تەسلیم‌بوونە بە چەوسێنەران .

**دیارە تروسکەی ئاگرێك بەفرێك .. چرایەك نابینی !!**
**دیارە بەردیش گوێت لێ‌ناگرێ بۆیە هێندە دەڕوانیتە**
**ئاسۆی دوورو خۆت دەدوێنی تاریکایی دەگریتەبەر**
**ڕەشەبای کپیت دەڕوێنی خۆت دەڕمێنی . ( ل ١٥ )**

بەڵام نەوزاد وەك لە سەرەتادا ووتم یەکێکە لەو شاعیرانەی خەمەکانی بۆخەڵکن نەك تاك‌و تەنیای خۆی .. بۆیە دەکەوێتە کێشە لەگەڵ ئەو خەیاڵە ڕەشبینی‌یانەداو دەیەوێ خۆی لەو خەوە سامناکانە بەخەبەر بێنێتەوە

**.بەگێڕەوە بۆ .. هەر لەم دیو .. دیوارەوە**
**دەم دوویێنی ؟ ( ل ٤١ )**

نایەوێ بینەربێ‌و هیچی‌تر . گەرچی جۆری پەروەردە کردنەکەی ناو خێزانی‌و ناو کۆمەڵانی ئەو خەڵکەی جاران‌کاری لەگەڵ دەکردن هەندێ جۆر لە بینەری دەسەپێنن بەسەردا . بەڵام ئەم لەناو ئەو هەمو تاریکی‌و پەروەردەی نارێك‌و گرێ‌و کۆسپانەدا .

**من لەودیو تەم‌و مژەوە**
**باوەشێك گلۆپ دەبینم دادەگیرسێ ( ل ٤٠ )**

ئائێرەوە هانی شاعیر دەدەین بەرچاوی ڕۆشن‌تر بکاتەوەو لەبەرهەمەکانی داهاتوویدا لاوێکی گەشترو جوانترو بە وورەتربێ‌و بڕوای بە هێزی گەل‌بێ .

چونکە ئەوساکە چورتم ئەزنۆی نانەوێنێ . بەتایبەتی بۆ ئەوێك ئومێد گەلێك پێویستە مادام ئەوەندە هوشیاری هەیە

**من پێش هاتنی باو بۆران چڵەکانم بینی شکان**
**پێش سووتانی ئاوی جۆبار ماسی‌و مەلم بینی خنکان**
**پێش بیستنی تەقەی تاپر پۆلە پاساریم دی پێکران**
**پێشە کەوتنی‌ئاەم بەفرە رەوەکەرم بینی خۆیان**
**لەڕەشایی شاخ دەکوتا ) ( ل ٧ )**

حەز دەکەین ئەو ووزەلاوەی هەیەتی هوشیارانەتر بیخاتە کار . تا پێشتر بکەوێ‌و ئەم ڕەشبینی‌یە ڕەت‌بکاتەوە

**من چاووم بۆ هەر ئەستێرەیێك هەڵبڕی**
**کەوت‌و ڕژا !!**

**هەر زێیەکم خۆش‌ویست سووتا . ( ل ٩ )**

با بەو خەمناکی‌یە نەڕوانێتە سرووشت‌و زەمینەیەکی پتەوو خێر خوازانەی‌وا بۆ خۆی دیاری‌بکا کەبێکا بە خاوەنی خۆشەویست‌و دڵدارێکی هەرگیز ئاوانەبوو تا وا نەمێنێتەوە :

**ئەوا تۆیشم لێ ئاوابووی**
**بێشەمدیوە دارەکانی خۆی ناشتووە ... هتد (ل٩)**

نەك ئەم شاعیرە لاوەمان بەڵکە ڕووی دەمم لە گشت شاعیرانی لاومانە هەرگیز هیوا بڕاوو ڕەش‌بین نەبن . دەنا لاشەی شیعری خۆیشیان دەنێژن‌و هەموو ژیان‌و ڕووداوەمەزنەکانی بێ‌هوودەو ووشك‌و ڕەش دێتەپێش چاویان

**لەو ساوە گەڵا رێزانە**
**لەو ساوە مەل نەهاتۆتەوە لانە**
**لەو ساوە مەل ئاسك دەمی نەناوەتە ئاومان**
**پەلەوەرێك نەهاتۆتە سەر کەنارمان ( گۆی کە نارمان )**
**( ل ٦ )**

هیوادارم لای نەوزادو لای هەموو شیعرنووسەلاوەکانمان ( ئەوانەی بۆ گەل خەمبارن ) ئەو ڕەشبینی‌و کەم وورەیی‌یە ڕوونەدا . دیارە نەوزاد درکی بە ئەنجامی ناتەواوی ئەو خەمناکی‌یەڕەشەکردووە بۆیە بە ترسەوە دەنگی هەڵدەبڕێ :

**ئەو ڕەشەبایە ڕاگرە . بیسووتێنە**
**ئەوەك چادرەکانمان بباو**
**کۆختەکانیش کورکاتەوە . ( ل ٣٧ )**

دیسانەوە ئومێدەوارم چۆن توانی زۆربا ڕەت بکاتەوە . ئاوایش ئەم بێ‌هوودەیی‌و خەمناکی‌یە ڕەشەی سیزیف ڕەت بکاتەوە . خۆی ئەو ڕەشەبا ڕەشە ڕابگرێ‌و بیسووتێنێ (یان کاربکا بۆ سووتاندنی) نەك داوا لە کەسانی تر بکا . چونکە نامانەوێ لاوەکانمان بینەرین‌و هیچی تر . با شاعیر باوەڕی بە توانای خۆی‌و گەل هەبێ . **چونکە ئەم گەلی عێراقە بە گشتی‌و کۆمەڵی کوردەواری بەتایبەتی هێشتا زۆر پێویستی بە نەوزادو نەوزادەها هەیە بۆ هێنانەدی خەوەمرۆڤانەکانمان بۆ بنیات نانی بێشکەی ئاوات‌و بەهەشتی سەرزەوی‌و نەهێشتنی چەوساندنەوەی ئینسان بۆ ئینسان ●**

# با ئاوڕێک لە شیرین و خەسرەو بدەینەوە

عادل عبداللە دارامانی

**لە ژمارە ( ٦٨ ) حوزەیران وتەمووزی ١٩٧٨دا گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ نوسراوێکی دەرکردبوو لەژێر ناوی «چەند تێبینیەك لە بارەی شیرینو خوسرەوەکەی خانای قوبادیەوە » کە کاك « کمال نوری معروف » نوسیبوویو لـــە « ٨ » تیبینیدا نوسراوەکـــەی داڕشتبوو لە هەر تیبینیەکدا باسێکی قەشەنگو جوانی لێ پێکهێنابوو . وەلە کۆتایی نوسینەکەیدا بەم شێوەیە دوایی پێهێنابوو :ـ**

**« ئەگەر کۆڕی زانیاری کورد ومحەمەدی مەلا کەریم نەبوایە ڕەنگە « شیرینو خوسرەو بەوشێـــوە قەشەنگە دەرنەچوایە ومنیش نەم ئەتوانی ئەم باسە پێشکەش بەخوێنەرانی بەڕێزی کورد بکەم » .**

**لە چوارەم تێبینیدا** نوسیویەتی لـــە مێژووی ســاسانیـــاندا داستانێك نیە بـــە ناوی « شیرین و خوسرەو » بە ناوی « شیرین و کسراوە هەیە .

ئەمەش وا دەرئەکەوێ کە « شیرین » دلداری لەگەڵ « کسرا و خوسرەو » داکردبێ چونکە لە هەموو کاتێکدا ناوی « شیرین » هەرلە پاڵ ناوی خوسرەوەوە بووە بە ناوبانکیشە دەڵێن « شیرینو خوسرەو » نەك « شیرین وکیسرا » لەشیرینو خوسرەوەکەی خانای قوبادیەکە لە بیرم ئەماوە زنجیرەو چاپی ساڵێ چەندە وا دەرئەکەوێ کە شیرین لە کاتـــی خوسرەودا بووە نەك لە کاتی کیسرا ، وەدیســـانـــەو دەری ئـــەخات کـــە خـــوســـرەو کـــوڕی هورمـــزەو هـــورمزیش کوڕی کیـــرایە کەچی کاك « کمال نوری معروف » وای ئێك ئەداوەوە کە « کیسرا » کوری هورمزی چوٚرەمە ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە یەك « کیسرا » نەبووە . بۆپاڵپشتی ووتەکەشم کە دەڵێـــم هورمز کوڕی « کیـــسرا » بـــە پـــەنا دەبـــەمە بەر شـــیرین وخوسرەوەکەی خانای قوبادی کە دەڵێ :ـ

**وەختێ کـــە کیسرا دەرچو لە دنیـــا**
**هورمزی کـــوردی بویـــە پادشـــــا**

لەگەڵ ئەوەشدا کاك کمال ئەڵێ نازناوی کیسرا « پەروێز » بووکە پێیاندا ، بەڵام شیرینو خوسرەوی خانای قوبادیە ناوی کیسرا هەر ناهێنێتو ئەڵـــێ « خوسرەوی پەروێز » نەك « کیسرا پەروێز » وا دەرئەکەوێ کە یەکەم ڕاستە و «کیسرا پەروێز» هیچ پەیوەندییەکی بە نازناوی « پەروێز » ەوە نـــیە . وەباوەڕیش ناکەم کە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم وابدتە قەڵەم کە « پەروێز » باوکی خوسرەو بووبێت

ڕەنگە کاك کمال نوری معروف بە تەواوی تێنەگەیشتبێ ، بەڵکو مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم وتبێتی : ــ

« خوسرەوی پەروێز » یان پەروێزی بەنازناوی خوسرەو دانابێ .

شیرین ڕەگەز و شوێنی زانراوە خەڵکی ئەرمەنستانە وەکو لە شیرین وخوسرەوەکەی خانای قوبادیەوە دەرئەکەوێ کە زۆر ناوی شاری ئەرمەن ئەهێنیتە ناوەوە . لەگەڵ ئەوەشدا کە لە شەشەم تێبینیدا کاك کمال نوری معروف ناوی ئەوەی هێناوە کە شەو دێزیشی خستۆتە پاك کیسرا ، لە بنەڕەتا کیسرا فری بەسەر شە ودێزەوە نی‌یە ودەبێ ئەو ناوە بخرێتە پاك خوسرەوی پەروێز ، چونکە شەو دێز هی خوسرەوی پەروێزە وهی کیسرا نیە . ئەو « کیسرا » یەی کە کاك کمال نوری معروف لە تیبینی یەکانیدا ناوی هێناوە دەبێ لە دوی خوسرەودا بووبێ بە شاو لە سەر تەخت دانیشتبێ ، چونکە پێغەمبەر ( د.خ ) لە کاتێکدا کە وەحی پێغەمبەرایەتی بۆهات خوسرەو شابوو نەك کیسرا .

پێغەمبەر ( د.خ ) داوا لە خوسرەو ئەکات کە موسولمان بێ بەڵام کاك کمال نوری ئەڵێ داوا لە کیسرا ئەکات کە موسولمان بێ . بۆ ئەم مەبەستەش پێغەمبەر ( د.خ ) نامە بۆ خوسرەو ئەنوسێ وە داوای موسولمانبونی لێ ئەکات کاتی کە هەڵگری نامە « قاصد » ئەگاتە لای خوسرەو ونامەی پێغەمبەری ئەداتە دەست ئەویش لە ڕقا نامەکە لەتلەت ئەکات و ئەڵێ « دەبێ ئەم محەمەدە کێ بێ وا جورئەتی کردبێ ناوی خۆی لە پیش ناو من نوسی بێ » چونکە پێغەمبەر د.خ ) نوسیبوی : ــ

« لە محەمەدەوە بۆ شاهی عەجەم « کەی خوسرەو » ناوی خۆی لە پێشدا نوسیبوو . بەڵام لە شیرین وخوسرەوەگەی خانای قوبادیە ئەمانە هەمووی ڕوونن وەوای دەرئەخات کە شیرین وخوسرەو موسولمان دەبن هەردوکیان .

لە تێبینی هەشتەمدا کاك کمال نوری معروف شیرۆی بە کوڕی کیسرا داناوەو شیرین‌و ماریا «مریم» وە کوردەوەیەش بە ژنی کیسرا داناوە بەڵام من ئەڵێم شێرۆ کوڕی «خوسرەو»ە وەماریا « مریم » وشیرین ژنی خوسرەون وەزانیاری تەواوم بەدەستە نی‌یە کە بڵێم « کوردەوەیە » ش ژنی خوسرەوە بەڵام

**بەشداربوون لە هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا ئەرکێکی نیشتمانییە**

ئەوەندە ئەڵێم مریم‌و شیرین ژنی خوسرەون وژنی کیسرا نین .

شیرۆ لە ماریا « مریم » ە کوڕی خوسرەوە ــ خوسرەو بە دەستی شێرۆی کوڕی کوژرا ، هەر لەبەرئەوەش کە حەزی لە شیرین کردبوو کە باوەژنی خۆی بوو ــ وەلێرەدا باسی ئایینی هاتە کایەوە و ڕەنگە بڵێن چون حەزی لە باوەژنی خۆی کرد ؟ منیش لە وەڵامدا دەڵێم لە وکاتەدا باوەژن مارەی ئەهات واتە « حەڵاڵ » بووەوکوڕ باوەژنی خۆی مارە ئەکرد . بەڵام کە ئایین پاکی موسولمانەتی بە تەواوی سەری هەڵدا ئەم ڕەوشتە نالەبارەی لە ڕەگ‌و ڕیشە دەرهێنا ونەیهێشت .

بۆ فەرهادیش ئەڵێم دەبێ بەڵگەیەکی مێژوویی هەبێت کە باسی بکات چونکە کاك « کمال نوری معروف » ئەڵێ « هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی بە دەستەوە نی‌یە کە باسی بوونی فەرهاد بکات »

منیش دەڵێم ئەگەر بەڵگەیەکی مێژوویی نەبێت کە باسی فەرهاد بکات ئەی بۆچی ؟ ناوی فەرهاد تێکەڵ بە داستانەکە کراوە . دەبێ بەڵگەیەك هەر هەبێت چونکە فەرهاد کوڕی خاقانی چین بووەو شیرین لە ئەرمەن یان « ئەرمەنستان » ئەی بۆچی بە خۆرایی فەرهاد تێکەڵ بەداستانەکە کراوە یان ئەڵێم بۆچی ناوی یەکێکی تریان نە خستە ناو داستانەکەوە .

داستانەکەش پڕە لە باسی دڵداری‌و خۆشەویستی کەچی کاك کمال نوری معروف لە تێبینی‌یەکانیدا زیاتر لایەنی شەڕو شۆڕی گرتووە .

دوا ووتەم ئەوەیە کاك کمال نوری معروف بە چاوێکی ڕەخنە گرانەوە سەیرم ئەکات‌و بە ڕوویووشەکانما هەڵنەشاخێ دڵێ نەڕەنجێ لەڕاستم هیوادارم ئەم نوسینەی من پاڵ پێوەنەرێك بێت بۆ زیادکردنی بەرهەم‌و هەمیشە بەرهەمی پوخت‌و نوسراوی قەشەنگ‌و جوان بڵاوبکاتەوە .



# دوو هۆنراوە

• ئەبوبەکر خۆشناو •

١ ـ توانەوە !
ئەودەمەی خۆت ،
لەباوەشی دڕکەزیمدا کرمۆلە کرد
منیش دەمم دەنێمە زامەکانتەو ،
دەتخۆمەوە
وەکوو منداڵێکی ساوا ،
ژیرنابیمەوە بۆنامێژی ئەشقم دەگری
ئەشقی منیش یاخی بوونە !
ئەگەر لێشم یاخی دەبی ؟
من چیامە !

★ ★ ★

٢ ـ مرۆڤ !
ئەگەر چۆلەکە بوومایە
دەبوو لەسەر درەختێکدا ،
هێلانەکی کچکەم هەبێ
ئەگەر مێروولەش بوومایە
دەکرا لەدرزی زەوی‌دا ،
چەندان شاری گەورەم هەبێ
بەلام چونکە من مرۆڤم
شوێنێك نی‌یە لەسەر زەوی
بمپارێزی لە گریەو ،
بمگرێتە خۆی !

★ ★ ★

# «کوێرەکانی»

**• سلام مەنمی •**

کوێرەکانییەك بوو ، هەتا بلێی ئاوی کەمبوو .. لەبەر دەمیشیا گوڵێك ڕووابوو .. ئاوی کانییەکەی هەڵئەمژیو گەشەی پێئەکرد .. بەڵام جرجێ ژیانی پێ تاڵ کردو ئاوەکەی لێبڕیو نەیهێشت بۆی بچێ .. گەڵاکانی زەردبوون ، خونچەکانی بەرەو هەڵوەرین ئەچوون ..

ڕۆژێ بەجرجەی ووت :

**– بۆچی ئاوەکەم لێ ئەبڕی ؟ چ سوودێك لەوەدا ئەبینی ئاوەکە بەژێر زەویدا بڕوات ؟! .. هیچ نەبێ ڕێبوار ئاو لەم کانییە ئەخواتەوە ، جگە لەوەیش بە دیمەنو بۆنی من پێخۆشحاڵ ئەبێ ..**

جرجە پێکەنیو ووتی :

**– تۆگێلی ..**

گوڵە بەسەر سامییەوە ووتی :

– بۆ .. ؟!

جرجەیش پێی ووت :

– ئەی نازانی من دوژمنی تۆ ومرۆڤم .. ؟

گوڵە پرسیاری لێ کردەوەو ووتی :

– بۆچی .. ؟!

– مرۆڤ لە هەر شوێنێکا من ببینێ ئەمکوژێت :

گوڵە ووتی :

– تۆزیان لە خەڵەو خەرمانی ئەدەیتو ئاوی لێ ئەبڕی ، ئەویش دەستت لێناگێرێتەوە .. باشە مرۆڤ ئەتکوژێ ، ئەی من چیم کردوە ؟ خۆ هەمیشە لە ژێر سێبەری منا پشوو ئەگرێت..

**– تۆیش خۆشەویستی مرۆڤیو ئەبینم بۆنت ئەکاتەو دڵەو داڵت لێ دوور ئەخاتەوە .. جا بە ڕیشی تۆ ڕەوایە تۆ هەوای زەوی بتشەکێنێتەوەو منیش لە کونا بم .. ؟!**

– ئاوەکە بەردە خۆ پەرستی بەسە .. با ووشك نەبم ..

– ئاو بەرەڵاکەم‌تۆو مرۆڤ بیخۆنەوە ؟

لەم باسو خواسە دابوون ، لەو لاوە پشیلە کێوییەك هات جرجەیش خۆی بە کونی کانییەکەدا کرد ، پشیلەیش بە دوایاو بە چنگە تیژەکانی هەڵیدڕیو جرجەی بەزیکەزیك هێنایە دەرەوەو کەوڵی کردو هەرلەوێدا خواردی .. دوایش بەری کانییەکەی بەچنگ پاککردەوەو ڕۆیشت. ئاوی‌کانی جارێکی‌تر هاتەوە بن گوڵەو ڕەنگی ڕوون بۆوەو ووتی:

– ئەمە ئەنجامی هەموو خۆپەرستێکە .

# سووتووی دا چۆڕانی ئەستێرەیەکی بێ ناز !..

مکرم رشید تالەبانی

که هاتیته ژیانمەوه
خۆت هاویشته چاوانمەوه ..
ئەو ئەستێره بێ‌نازه بوویت
فراوانی‌ی دلی ئاسمانی دلداریت
لەگەل خۆت‌دا .. هەلگرتبوو !
منی خەمیش ئەو ( با ) یه بووم
بەرەو دەشتی چاوەکانت
ڕیگای پڕ پەیکولی هات‌ونەهاتم
گرتەبەر !
لەسەر لووتکەی بێداریوه ..
هەلم‌کردو
تۆی پێزاریش ، سێبەرێك بوویت
له لێو دەریاکانی
هۆل‌لێهاتووی خەمناکی‌دا
ڕاکشابوویت !
بۆیه هاتم خۆم هاوێشته چاوانتەوه
تاکوو خەوی پیرچوونەوه ..
لەناو بێشەی ماچەکان‌دا .. بتوێتەوەو
پۆله مەلی دلی شەیدا
بەرەو نوورگەی لێوەکانت
بالی خۆشی بگرێتەوه !
کەچی خۆم‌دێت .. سالی سەوزی بەتەمەنم
تۆش زستانی
پڕ له پیت‌و پیرۆزیمیت .

کاتێك له هاوینی خەون‌و پەژارەدا
ڕووت دەکرده خەمی شین‌و ڕێ‌ی دڕکاوی
بوویته ئەو ئاوازەی
له بەهاری لاوێتی‌دا ..
به لاولاوی ژیانم‌دا ، هەل‌دەزنایت ..
ووشەیەك بوویت
له دەنگم‌دا ، سواری زینی ئۆرکسترای
زامان دەبوویت !
که تۆرایت‌و مال‌ئاواییت لێ‌کردم‌و
بەجێت‌هێشتم
بەدووات‌دا .. دەریای چاوم
بوو به دەشت‌و بیابانی مانگ‌و خۆرو ئەستێرەکان !
له باوەشی ڕێگاکان‌دا
خۆم وون‌کردو ڕێگاکانیش وونیان‌کردم
گەرم‌و گوڕی‌ی باوەشیانم
نەبینیەوه !
له گێژەنگەی برینێك‌دا
گیرسامەوەو
کلیلی ئەم دلە کۆرپە پڕ له زامەم
دایه دەستی پەژارەو غەم !!
له سێبەری سەد پەیکەری خەون‌و یاده تالەکان‌دا
دەستەوئەژنۆ
لێ‌ی‌دانیشتم ! ●

۱۹۷۷-٦-۹

# لەشاعیرە ناووونبووەکانی کورد

محمد صالح عبدالکریم

ـ ئەم شاعیرە ناوی [ مەلا محەممەد ئەمین ] ی دێلێژەیی یەو کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا مستەفای کوڕی مەلا محەممەدی میرحەسەنی میرە کۆستەبووەو لە تیرەی شێخ سمایلیە ...

ـ باوکی شاعیر کە خەلیفەی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ بووە بە گوێرەی ئەو نامەیەی کە حاجی کاك ئەحمەد بە مۆری خۆی ناردویەتی بۆ دێلێژەبووە بە ئیمامی دێلێژە ، بەڵام بەداخەوە نامەکە بەرواری پێوە نی یە .

ـ شاعیر لە سالی ١٣٠٧ی کۆچیدا کە بەرانبەری سالی ١٨٨٧ی زاین ئەکات هاتۆتە دنیاوە .

ـ خوێندنی شاعیر .. لە تەمەنی (٨) سالی تا ١٠ ـ ١٢ سالی لە خزمەت باوکیابووەو لە دواییدا ئەمیش وەکو هەموو مەلاو زاناکانی ئەو سەرودەمەو لە پێناوی تەاووکردنی خوێندندا ئەم شارو ئەوو شار کەوتۆتە گەڕان ... سالێك لە ( قەلاسورە )ی ناوچەی قەرەداغ بووە لە خزمەت مەلا عەبدوللای تەنگی سەرداو سالێك دووانیش لە ( بیارە ) لە خزمەت مەلا قادری کانی کەوەیی دا بوەو ئینجا نزیکەی سالێك یان زیاتریش لە ( قەرەداغ ) لە خزمەت شێخ نجیبی قەرەداغیدا بووەو ئینجا هاتوەتەوە بۆ دێلیژەو ماوەیەکیش لای باوکی ماتەوەوو چوە بۆ کوردستانی ئێران بۆ خزمەت مەلا کاکەحمەی (ناری) لە دێی ( بێلوو ) پاش ماوەیەك هاتەوە بۆ دێلیژەو

باووکی ژنی بۆهێنا ، لە دەوربەری گرانیەکەدا باوکی ئەمرێو ئەچێتە جێی باوکی تا لە سالی ١٣٥٣ ی کۆچیدا فەرمانی خوای بەجێ هێناوە ... دیارە خولیای شاعیریەتی لەو کاتەدا بووە کە لە خزمەت مەلا کاکەحمەدا بووە ... شیعری بەکێش و سەروایەکی ڕێکوپێکو کوردییەکی پەتی جوان ووتوە لە چاو شاعیرانی تری ئەو زەمانەیەدا ...



لە پێشدا نازناوی شاعیریەتی ( معصوم ) بووەو لە دواییدا کردویەتی بە ( عاصی ) .

ئەمەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی :

دەمی هیجرانە ڕۆژی شینە ئەمرۆ
ئەوی شایستەبێ نالینە ئەمرۆ
کە چونکە خوانە خواستە یاری جانی
خەیالی هیجرەتو ڕۆیینە ئەمرۆ
دەڕێژی هەردو چاوم خوێن بە خوڕزم
وەك ئەلوەند دامەنم ڕەنگینە ئەمرۆ
بلیسەی ئاگری ئاهو هەناسەم
گڕی بەردایە تەختی سینە ئەمرۆ
قیامی کرد قیامەت وەرنە بۆچی
لە صبحا ڕۆژ ئەوەندە شینە ئەمرۆ
تەماشاکە فەلەك خانەی بڕوخێ
لەگەڵ من چەند بە بغضو قینە ئەمرۆ
لە دەس ئەم چەرخە کۆنەو خو خراپە
لەسەر ( معصوم ) بەلا بارینە ئەمرۆ

(١) بەسەر هاتو ژیانو کۆمەلێك شیعری تری شاعیر ... لە مامۆستای بەڕێز شێخ اسماعیل دێلیژەییم وەرگرتوەو ... نیازیشم وایە لە چاپیان بدەم لە نامیلکەیەکدا تکام بۆ خوێندەرانی بەڕێز ئەوەیە چی ئاگاریو شتیان هەیە بۆم بنێرنو لەگەڵ ڕێزو سوپاسمدا ..

# هنری جیمس..
# کەڵە نووسەری ئەمەریکا ١٨٤٣ - ١٩١٦

لیون ئیدل
نووسیویەتی

محمد موکری
کردوویە بە کوردی

## بەشی دووەم

بۆ ئاسانکردنەوەی ژیانی هنری جیمس ، زۆربەی ڕەخنەگرەکان ژیانی ئەد بیی هنری دابەش دەکەنە سەر سێ (قۆناغەوە) . . جارێکیان یەکێك لە نووسەرەکانی بەریتانیا بۆ نوکتە ئەم دابەشکردنەی کرد ، ئەویش بە پێی زنجیرەی خانەوادەیی :

١ ـ (جیمسی یەکەم)
٢ ـ (جیمسی دووهەم)
٣ ـ (ناوبراوی پیر) .

ڕستەی ( ناوبراوی پیر ) ئیشارەتە بۆ شێوازی سفتو چڕو یەکگرتووی لە سەردەمی پیریدا ، بۆ ئەو ووشەو ڕستە لەو لەبیبیانەیو ئەو هەوڵو تەقەلا بێئەندازەیەی بۆ ووردی لە دەربڕیندا ، ئەمیش لەسەر حیسابی دانبەخۆداگرتنی خوێنەوارانە . .

وردبوونەوە لە زنجیرەی بەرهەمەکانی قۆناغی یەکەمی ، یەکیەتییەکی ڕوون دەداتەدەستەوە لە قۆناغی مەشقو سەرکەوتنی ، دۆزینەوەی ناوەرۆکی جیهانیو گەورە . . دەتوانین ئەوە بڵێین ئەم قۆناغە بە چیرۆکی ( نیگای بانوویەك ) کۆتایی پێدێت . .

قۆناغی دووهەمیشی ، گەلێك جار وا باسکراوە کە قۆناغی چیرۆکە کۆمەڵایەتییەکانی جیمس ـ ە ، ڕاست وایە ئەم قۆناغە دابەشبکرێتە سەر سێ بەشەوە ، ئەویش بۆ ماوەیەك ناوەرۆکە جیهانیەکانی بەجێهێشتو سێ چیرۆکی درێژی نووسی لەسەر شێوەی (نروشتیەکان ) پاشان بۆ پێنج ساڵ دەستی لە چیرۆکنووسین هەڵگرتو خەریکی شانۆ بوو ، پاشان لە ساڵی ١٨٩٥دا دووبارە گەڕایەوە سەر چیرۆكو بۆ شەش ساڵ خەریکی چیرۆکنووسین بووەو، لەسەر شێوەی ( تەجریبییەکان ) هونەرەکانی شانۆی هەڵمژیبوو . ئا لەم تاقیکردنەوانەیدا قۆناغی سێهەمی سەریهەڵدا ، لەوە قووڵترو دوورترە کە ناوی ( ناوبراوی پیری ) لێبنرێت ، بە شێوەیەکی ووردتر ناویانلێنا کە ( دەوری گرنگ )ە . . لە ڕاستیدا دەورەکەی گرنگبوو بەوەی کە کارتێکردنێکی تەواوی لە چیرۆکی سەدەی بیستدا بەجێهێشتو ، لەم قۆناغەی دوایی جیمسداو لە ماوەی چوار ساڵدا سێ چیرۆکی نووسی ، بە گەورەترین جێماوەی هنری بۆ نەوەکانی داهاتوو دەژمێردرێن . . .

قۆناغی یەکەمی لە ١٨٦٥ ـ ١٨٨٢ دەستپێدەکات بە چیرۆکی ( دیزی میلەر ) دەستنیشاندەکرێت . . . پاش چەند ساڵێك جیمس باسی چیرۆکەکەی دەکات کە ( سەرکەوتووترین زادەی مێشکیەتی ) .

لە سەردەمی ژیانیدا بە دەرجەی یەك ناوبانگی لەسەر لێکۆڵینەوەکانی دەرکردبوو ، ئەو لێکۆڵینەوەمو بەر ڕەسیبانەی کە دیزی میلەر ببووە نموونەی ئەو کچە هەرزەکارە ئەمریکیانەی ئەورووپا . . .

ئەم چیرۆکە لەناو خانەوادە گەڕیدەکانی ئەمریکادا ناوبانگی پەیداکرد و گفتوگۆی لەسەر دەکرا ، کە ئەم گەشتەیان ئەرکێکی پوخڵەو لە وڵاتی یەکەوتوودا هیچ خۆشییەکی تیادا نییە ، ئەم

ئەمریکییە گەڕیدانە ئەوە دەدۆزنەوە کە پاڵەوانە گەنجەکانی هۆتۆرن دۆزیبانەوە ئەویش کە ئەم دنیایە لەو خاوێنییەدا نییەوا لەبەر چاودایە ، لەپشت دیوارەکانی قەڵاکانو وێرانە جوانەکاندا ، دەیان سەدە لە زوڵمو گوناهی دەروونی ئینسان ، خۆی مەڵاسداوە ... دیزی میلەر ئەمەی لە ئاستی گاڵتەجاڕیو ترازیدیادا کۆکردووەتەوە ..

چیرۆکی دیزی میلەر ..

دیزی کچە هەرزەکارێکی جوانەو دەگاتە رۆما ، هێشتا شەونمەکانی وڵاتەکەی لە روخساریدا ووشك‌نەبووەتەوە ، بەڵام هەرگیز دەرکی بەوە نەدەکرد کە ژیانو پێو رەکانی ژیان لە ئەوروپادا جیاوازیی لەگەڵ ئەو ژیانەدا هەیە کە لە شنکتری نیۆیۆرکدا ناسیوبەتی .. سەرنجی چرپەی هاوڕێ ئیتالیەکەی دەدا ، هەروەها ئەوروپیەکانو ، ئەو ئەمریکییانەی کە بە ئەوروپیەکان دەچوون ، لە چرپەکانیان ئەوەی بۆ دەردەکەوت کە ڕووبەڕووی مەسەلەیەکی ترسناك بووە .. .دیزی هەرگیز گوناهی نەدەزانیو ، ناشتوانێت بیری لێ بکاتەوە ، نەی دەتوانی دەرك‌بەوەبکات ، کە بۆچی ڕەفتاری ئاڵۆزدەبێت ، کە ئەم ئاڵۆزییە کۆمەڵایەتییە بەدی‌دەکات ، گەرچی‌وا ی بۆ دەردەکەوت کە ئەم ئاڵۆزییە دوورە لەوەی ئەزیەتی‌بدات ..

جیمس لە بارەی ئەم چیرۆکەیەوە دەڵێت :
« بیری ئەم چیرۆکە بە دەوری تراجیدیایەکی بچووکی گیانلەبەرێکی بەستەزمانو لاوازو دڵساف دەسووڕێتەوە .. لەسەر سەلیقەی خۆیەتیو گومان لە هیچ شتێك ناکات .. دەبێتە نێچیری ئاڵۆزیو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی کە بە هۆی ئەمەوە بەرپادەبێو ئەمیش پەیوەندییەکی گەورەی بەم ئاشووبەوە نییە.. بۆئەوەی تراجیدیاکە گەرمتربێ ، دایکی دیزی ـ یشم لەوتاندووتە ئەم کارەساتەوە )

گومان لەوەدا نییە هێزی ئەم چیرۆکە لەوەدایە نیگایەکی زۆر خراپی دایکی دیزی کێشاوە ، هەروەها ئەو برا گەنجەیشی هەرگیز یاسا نازانێت ، هەروەها نیگای ئەو خانەوادەیەی چینی ناوەندی بەرزی بە جوانی کێشاوە .. دایك‌و باوکێکی سنگ‌فراوانو ملکەچ بۆ کوڕو کچەکەیان .. لە کاتێکدا ئەم خانەوادەیە لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی هاتوون ، دایك‌و باوك نەزانن هیچ دەسەڵاتێکیان بەرانبەر بە سەرکێشی منالەکانیان نییە ، تراجیدیاکە قووڵتردەبێتەوە کاتێ کە جیمس سەرنجە سەفسەتائیەکانی ئەم خانەوادەیە دەردەخات بەرانبەر بە ئەمریکیە نامۆکان کە هیچ داوێك نەماوەتەوە لەنێوانی خۆیانو وڵاتی خۆیاندا .. نۆج دادانی نامۆی ئەمریکی لە تێگەیشتنی کچە ئەمریکییەکی ( نوێ ) کە لە دیزیدا نموونەی دیارە لە کۆتاییدا هەست بە گۆشەگیرییەکی زیاد دەکات ، چاریش بۆ دیزی نامێنێتەوە ، جگە لە پۆژموردەبیو مەرگ نەبێت .

★ ★ ★

هنری جیمس لە چیرۆکی ( رودریك هدسن )دا نیگای ئەمریکییەکی هونەرمەند دەکێشێ لە دەرەوەی وڵاتەکەیدا بە دوای قوتابخانەکانو هونەردا دەگەڕێت کە لە وڵاتەکەی خۆیدا نییەو .. لە چیرۆکی ( ئەمریکایی )دا The American کە پاش دوو ساڵی دی وەدەرەکەوت ـ کە چیرۆکێکی ئاسانو ڕەوانەو لە هەموو چیرۆکەکانی زیاتر رۆمانتیکی‌ترە، نیگای پیاوێکی سەرمایەدار دەکێشێت ، کە باوەڕی زۆری بە خۆی هەیەو ئەم باوەڕ زۆرییەش زادەی بەرائەتیەتی ، بەدوای هاوسەرێکدا دەگەڕێت لە چینی ئورستقراتی فەرەنسی بێت .. چیرۆکەکە تێکەڵە لەنێوان میلۆدراماو ڕۆمانسیەت ، لەم چیرۆکەدا هنری جیمس مەبەستییەتی گللەیی‌یەکانی بخاتە بەردەستی خوێنەواران : کریستۆفر نیومان ، بە کۆلۆمبس ناوی‌دەهێنێت ، نموونەیەکە لە پیاوی ( نوێ ) لە جیهانی ( نوێ )دا ڕێی لەنێوانی گەورەپیاوائی ( نبلاء ) دنیای کۆندا وون‌کردووە .

گەنیون .. دەیانەوێت دەستی بەسەردابگرنو سامانەکەی بە فیڕۆ لەدەست‌دەرکەن ، بۆیە زۆریشیان ڕقی‌لێ‌دەبێتەوە .. بۆ ئەم ئەمریکییە دەلوێت تۆڵەی خۆی وەرگرێت .. بەڵام دەگاتە قەناعەتو بەخۆی دەڵێت ، دوو هەڵە راستییەك وەبەرهەم‌ناهێنن ، بەم شێوەیە لە گەورەیی ئەوان گەورەتر دەبێت ، زیاتر مەسیحییەکی ڕەوشت بەرزتر دەبێ لەوان ، چیرۆکەکە بە هەڵچوونێکی بێ‌دەنگ کۆتایی پێ‌دێت .. .کاتێك کە نیومان شەقامە ساردەکانی پاریس بەجێ‌دێڵێت ، خۆشەویستەکەی بەندی کلیسایە ، لەم کاتەشدا دەنگدانەوەی زەنگەکان لە ئاسماندا ددلەرێتەوە ، ناوبەناویش ووشەی (خوا)

نووبارەدەکاتەوە ، ئەمانە بە مێشـکیا تێدەپەڕنو ، دەبنە مایەی تێفکرینیو دەڵێت :

« تۆلەسـەندن گەمەی من نییە » .

★ ★ ★

بەسەرکەوتنی ( دیزی میلەر ) جیمس بە زوویی تێدەگات کە جەماوەر ئەو چیرۆکانەیان بەدڵە کە باس لە ژنهێنانی جیهانی دەکاتو باسی ئەو کچە ئەمریکیە وورِیانە دەکات کە ئەوروپایان لا ئاشکرادەبێت ، ئەم چیرۆکەناشی ڕاستیی ئەمە دەسەلمێنێت :

ـ دوا کەسی آل فالیری
The last of the Valerii

ـ مۆف ، خانم
Madam de Maves

ـ چوار چاوپێکەوتن
Four Meetings

ـ چیرۆکی دیزی میلەر ( ئەمەیان زۆر بەتایبەتی ) .

پاش ئەمانە هنری جیمس لە هـەموو ناوەرۆك بابەتێکەوە ددستی بە نووسین کرد ، لەچیرۆکەکانی :

کچێك پشتی بـــە خۆی ئەستوورەو خـــۆی پەروەردەکردووە ، ژیان بۆ دەزگیرانەکەی ئامادەدەکات بۆئەوەی بیخوازێت ..

یان کچە گەورە ئنگلیزییەکان ، ئەوانەی شوو بە ئەمریکیەکان ددکـــەن ، ڕقیان لە مێردەکانیـــان دەبێتەوە ..

یان چیرۆکم ئەمریکیەکان کە ناتوانن دەرك بـــە فرتوفێڵی هەنـــدێك لە ئەوروپیـــەکان بکەن .. ئەمجۆرە چیرۆکانـــەی ، ئەفـــــوونیو کۆمێدیو دووربینانەبوو .. لە هەموو گۆڤارەکاندا دەینووسی ، سەرنووسەرەکان داوای زیاتریان دەکرد ، کەسیانی بێ بەرەی نەدەکرد ، ئێستا وا دەردەکەوێ گـــەر سـەرنجی ئەو لیستە درێژە بەرهەمە جیهانیـــەکانی بدرێت کە هنری بە هەردوو دەستی دەینووسی ..

کاتێك کە لەندەن لە ناخیەوە بە دیزیو براکەی پێدەکەنی هنری وەڵامیدانەوەو چیرۆکێکی نووســی کە ئەمریکیەکان بتوانن بە لە خۆبایی‌بوونو گـەوجی بەریتانیـــەکان پێبکـــەنن کاتێك کـــە دەچن بـــۆ ئەمریکـــا « ڕووداوێکـــی گرنگـــی جیهـــانی »
An International Episode بەم کارەی توانی گەمە بە سۆزی نەتـــەوایەتی بکات .. ئەمریکـیو ئنگلیزەکان چێژ لەوە دەبینن کە بە یەکتری پێبکەنن ، بەڵام حەزناکەن بە خۆیان پێبکەنن ..

لە کانوونی یەکەمی ١٨٧٩دا چیرۆکی ( باوەڕ )ی دەرهێنـــاو پاش دوو ڕۆژ کتێبێکی دیی بەنـاوی ( هۆثۆرن )ەوە دەرهێنا .. لەسەر داوای جون مۆرلی John Morley ، هنری جیمس کتێبی (هۆثۆرن)ی نووســـی تا لە زنجـــیرە ئەدیبـــەکانی ئنگلیزدا English Men of Letters Seies بڵاوببێتەوە

ـ کتێبێکی بە نرخەو دیارییە لە کەڵە نووســـەرێکی ئەمریکی بۆ کەڵە نووسەرێکی ئەمریکی دی ، باســـە بنەڕەتیەکانی ئەم کتێبە لە سەر ئەوە دەسووڕێتەوە کە لە سەردەمی هۆثۆرندا ، ئەمریکا پێویستیی بـــە کۆمەڵگاو مێژوو هەبووە ، لەبەر ئەوەی هیچ مەرجێکی سەرەکی کۆمـــەڵایەتیی نەبووە تا چیرۆکنووســـە ئنگلیزەکان بیکەنە کەرەسەی بەرهەمەکانیان ، کارەکانی لە ڕووداوە مێژوویەکانی مێژووی بیوریتانی ترسناکی نیوئنگلند هۆنیوەتەوە .. هنری جیمس شوختـــی بەسەر هەستی سەرنووسەرەکانی ئەمریکادا هێنـــا کاتێك کە نیگای ئەمریکای لەسەردەمی هۆثۆرن ـ دا کێشاو باسی بێ یاسایی ئەو سەردەمـــەی ژیانی ئەمریکیی دەکرد ، هنری جیمس دەڵێت :

« لەو ڕۆژانەدا ، لە ئەمریکا شتی بزورگو مەزن نەبوو ، شایستەی ئەودبێت مرۆڤ سەیریبکات جگە لە ( جەنگەڵو ڕووبارەکان ) ژیانیش ئەوەندە خۆش نەبوو ، کۆمـــەڵیش زیرەك نەبوون .. دراوێکی زۆر دەستەڵاتی بەسەر وڵاتدا کێشابوو ، بورژوازیەکانی وڵات لـــە نەش‌ونمادابوون ، زانـــــتو فێربوونی سەرەتاییو جێی رابواردن زۆر بوون .. »

ئەم جۆرە ددربڕینە ، سەرەڕای ووردیی بەلای هەندێك خوێنەوارەوە وا دەردەکەوت کە سەرنجێکی سووکانەی هنرییە ، هنری چەند جارێك ووشەی ( لادێیی )ی زیاد لە پێویست بەکاردەهێنا ، ڕەنگـــە هەستە جیهانیەکانی وای بۆ شیکردبێتەوە کە ئەوە لە ئاست خۆدابەزینەو منەتە ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی دەبووە مایـــەی ڕووبـــەڕووبوونـــەوەو ڕقەبەڕێ ، بەکارهێنانی ڕستەی ( ئەمریکای جوانو گەشایەوەی بارنەکراو بە نەریتو یاسا ) ، کاتێك جیمس ئـــەو کەرەسانەی دەکرد لە بەر دەستی چیرۆکنووســـانی ئنگلیزدا ، کە باسی نەریتی ڕەفتارو ڕەوشتی کاخی شاهیو کلیـــاو کۆمەڵگاو نازناوە گەورەکان بوو .. لەم باس‌کردنەدا بەراوردێکی بۆگەنیان دەبینی ، ئەم کتێبەی بووە مایەی چەنـــد هێرش‌بردنو تووڕەیی رەخنەگران لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەمریکادا ، لەو

سەردەمەدا ئەفسانەی « هنری جیمس نامۆیەو گاڵتە بە هاونیشتمانیانی دەکات ، ئاستی ئەوروپا لەسەر حیسابی ئەمریکا بەرزدەکاتەوە » سەری‌هەڵدا .

لەکاتی ئەوەی کە لە ڕێی نووسینەو- پاروی پەیدادەکردو لە چاکترین کاتی ئەم کارەیداو بە میزاجێکی فراوان‌و بێ خۆبغدان سێ چیرۆکە بەناوبانگەکەی نووسی ، هنری سێ چیرۆکە بەناوبانگەکەی بێ زۆرلەخۆکردن نووسی ، چیرۆکی ( باوەڕ ) لەم سێ چیرۆکەدا بابەخێکی کەمی هەیە ، چیرۆکێکە بە گاڵتەجاڕییەوە شتەکان دەردەبڕێت ، لە هەمان کاتیشدا بە جۆرێکی ساکار کۆمیدیای ڕەوشتە .. بەناوبانگترینی سێ چیرۆکەکەی ، چیرۆکی « گۆڕەپانی واشنتن‌ـە » Washinton Square لە نیویۆرکدا ڕوودەداوەکانی ڕوودەدات ـ

کچێکی ساکار لە خانوویەکی گەورەی گۆڕەپانەکەدا لەگەڵ دایك‌و باوکە دەوڵەمەندەکەیدا دەژێت ، دایك‌و باوکی ڕێی شووکردنی لێ دەگرن‌و قایل‌نابن شووبەو خۆشەویستە پەرپووت پۆشەی بکات .. ئەم چیرۆکە وا نووسراوە هەروەکوو پارچەیەکە لە ئەدەبی سروشتی وەکوو ئەدەبی هەردوو برا جۆنکۆر دەکەوێتە بەرچاو یان لەسەر شێوە نوێیەکەی بلزاك لە ( ئۆجینی جراندێ ) نووسراوە .. ئەم چیرۆکە تا ماوەیەکی زۆر لەلای خوێنەوارانی جیمس‌دا ، خۆشەویست بوو ، پاش مردنی جیمس ئەم چیرۆکە کەسانی تری لە خۆ کۆکردەوە ، کاتێك کە لەسەر شانۆ نوواندراو لە سینەماشدا بەناوی ( میراتگر)ەوە The Heiress دەرهێنرا ..

جیمس‌یش ، هەمیشە ئەم چیرۆکەی بە کاڵ‌و بێ‌بایەخ‌و ساکارو خاڵی لە هەموو ڕەوشتێکی تاقی‌کردنەوەکانی دەزانی ، کە چیرۆکەکانی تری بەلای خۆیەوە باشتربوون‌و ڕەچاوی ئەمانەی کردبوو ..

دوا چیرۆکی ئەم سێ چیرۆکەی بۆ بازاڕ نووسراوەتەوەو ناوی ( ئەوروپییەکان )ە The Europeans ، لەسەر داوای ( ولیەم دین هاولز ) کە تکای‌لێ‌کرد بۆ گۆڤاری (ئەتلانتیك مۆنثلی) نووسی .. چیرۆکێکە کەمتر بە جۆش‌و ئازار بەخشە لە چیرۆکی ( ڕودریك ) ، زیاتر گەشاوە ترە ، لە چیرۆکی ( ئەمریکی .. لە بەجێهێنانی ئەم داوایەدا ، جیمس ڕەنگی بە باری جیهانی داوەتەوە ، لەباتی ئەوەی باس ئەمریکیەکانی دەروە بکات ، ئەمریکیەکانی گەڕانووەتەوە بۆ بۆستن پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە ئەوروپادا ژیاون‌و ، شتێکی زۆر کەم نەبێت هیچ شتێك لەسەر وڵاتی خۆیان نازانن ..

جیمس کۆمیدیای ( ئەوروپییەکان )ی بە دەوری ڕەوشتی کۆمەڵێ لە دانیشتوانی دڵ ڕەقی نیوئنگلەندا دەسووڕانەوە . بەڵام خوێنەوارانی بۆستن چێژیان لێ‌وەرنەدەگرت ، ئەگەرچی لەم ڕۆژەدا بە چاکترین داهێنانی ئەم نووسەرە دەژمێردرێت لە ڕووی پێکەنین‌و گاڵتەجاڕییەوە ..

ئێستا پاش ئەم چیرۆکانە جیمس دەتوانێت دەست بە نووسینی چیرۆکی ( نیگای بانوویەك ) بکات ، گەشتێکی بۆ ئیتالیا کرد بە ووردی بە هەموو بەشەکانی‌دا دەهاتەوە ... سەرکەوتنی وەدەستهێنا .. بە گۆڤاری ( مەکمیلان )ی لەندنی‌و گۆڤاری (ئەتلانتیك)ی فرۆشت‌و دەستهاتێکی چاکی وەدەستهێنا کاتێك کە بەزنجیرە بڵاویان کردەوە ، لەمە گرنگتر جێی پێی ناوبانگی نووسەر لە هەردوو دیوی ئۆقیانووسدا چەسپا ، ئەم چیرۆکەی گەورەترین تابلۆیەتی ، چاکترین وورده‌کاریشی تیادا بەکارهێنابوو تائەو کاتە . گەر پاش ئەمە دەستی لە ئەدەب هەڵگرتبایەت، کەچی هەروەکوو گەورەترین نووسەری چیرۆکی ئەمریکی لەقەڵەمدەدرا ، ئەوەی ڕوویدا تا ٣٠ی ساڵی داهاتوویش بەرهەمی گەورەو بەپێزتری نووسی ..

چیرۆکی « نیگای بانوویەك » سێهەم کۆمەڵە چیرۆکەکانیەتی لەسەر ئەمریکیە نامۆکان ، لەمەوبەر ، کەسێکی هونەرمەندی لە ڕۆمادا داهێنا سەرمایەداریکیش لە پاریس .. ئەوا لە ئنگلتەرەش ئیزابیل ئارتشری کچە ئەمریکی‌و زادەی ولایەتی ئەلبانی ، لەنێو دنیای کۆندا لەنێوانی داخوازی کەرەکانیایە ، ئەم کچەش میراتگری سامانکی چاکە ..

سەربەستی بێ‌بەخشراوە کە لەپێناویدا کۆششێکی ڕۆمانسیانەی دەکرد ، کچێکی لەسەرەخۆو زیرەکە ، سووك نییەو بەدوای مێرددا بگەڕێت ، وەك ئەوەی جیمس لە دیزی میلەر یان بانسۆرادای‌دا نیگای کێشاون .. ئەو درامایەی تێ‌دەکەوێت لەو سەرپشك‌بوونەدا حەشاردراوە ، لەم هەڵبژاردنەیدا وە دەزانێت بە ( سەربەستی )یەوە دەجوولێتەوە کاتێك کە بۆی دەلوێت شوو بە ـ لۆرد ـ ێکی

بەریتانیایی بکات ، بەڵام دان بەخۆیدادەگرێت کە شوو بە ئەمریکییەکی دڵڕەق ، بیانووگر بکـات ، بەڵام ئەمریکییەکە ڕاستەو ڕاستگۆیە — .

هەستدەکات ئەم دوو کەسـە لێی ناگەڕێن سەربەست بێت ، کاتێك کە هەڵدەبژێرێت ، ئـەو کابرایە هەڵدەبژێرێت کە لە کۆتاییدا لە هەموو مێردێك زیاتر سەربەستییەکەی دەجەرێنێت و کۆتی دەکات .. ئەویش ئەمریکیەکەیە ، حەز لە هونەرە جوانەکان دەکات ، دڵڕەقە ، تووڕەیە ، ..

ئەگەر ئیزابیل نێچیری ڕەفتـارە ساکارەکان وورێنە ڕۆمانسیەکانی خۆی بێت ، لە هەمان کاتیشدا نێچیری داوێکی وورد چنراوی کابرای مێردبەتی ، کە کچێکی لە دۆشتێکی پێشووی — مەدام مێرل هەیە ..

مەدام مێرل دەبێتـە هاوڕێی ئیزابیـل — ی ڕاستگۆو بەبارمەتی مەدام مێرل ، هەموو میراتییەکی ئیزابیل دەکەوێتە نێو چنگی کابرای ئەمریکی کـە دەیەوێت لە ڕێی میراتی ئیزابیل — ەوە داهاتووی کچەکەی مسۆگەربکات ..

چیرۆکنووس هەڵس وکەوتی لەگەڵ میلۆدرامای ئـەم چیرۆکەدا دەکات بە شێوەی ڕیالیزمێکی ناسراوبوو .. وا دەزانرا هنری لەم چیرۆکەیدا کارێکی کردووە کـە خوێنەوار دەتوانێت زۆربەی چیرۆکەکان هەڵمژێت و لێیبگات گـەر نیگای کەسـەکانی بە ڕاستگۆییـەوە کێشران ..

ئەو زنجیرە کەسانەی بە دەوری ئیزابیـل — دا کێشراون ، هێزێکی بەتین و قوولییەکی گەورە دەخاتە سەر چیرۆکەکەوە .. ئا لەمەشدا لە خودی ئیزابیـل کەمترنین ..

بەدەگمەن لەنێوانی زۆڵەکانی ( سایکۆلۆژیا )دا وێنـەی زۆڵێکـی وەکوو ( جلیبرت ئۆزمۆنـد ) بەدی دەکەین کـە زۆر بە ووردی و شارەزاییـەوە وێنەی کێشاوە ، مێردێکی ئێسك قورسی دڵ ڕەقە ، بەڵام دۆستەکەی ( مەدام مێرل ) داوچنـەودەمامکی خۆشەویستی لە روخسـار گرتووە ، ئەمیش چاکترین کەسانی واقعیی جیمسە ..

چیرۆکەکە ، هەنگاو هەنگاو وامان نیشادەدات کە چۆن ئەو ئیزابیل — ەی دەربەسـتی نەریتەکان دەکەوێتە ژێر کەڵبەی بەردەناشی نەریتەوە ...

ئیزابیل ، ژیانە تایبەتییەکەی ، وورێنەکانی و ، لاچوونی ئەم وورینانەش لە ڕاستیدا هیچ نییە تەنیـا وێنەی سایکۆلۆژییەتی .. کەچی زۆر بە ئازایەتی . بە جەرگەوە ڕووبـەڕووی چارەنووسی خـۆی دەبێتەوە ... بەڵام جیمس ئەودمان نیشان دەدات لە پشت ئەم هەڵویستەو ئازایەتییە ، ترس و ڕاڕاییەك هەیە ، جیمس لەم چیرۆکەیدا ڕۆشنایی خـستووەتە سەر ئەو سـاتمە رۆمانسـییەی دنیای نوێ بـەو ڕاستیەتاڵانەی کـە لە مێژوودا زانراوە لە دنیـای کۆندا .

هۆی سەرکەوتنی چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بـۆ کێشانی ( شەخصیەتی ) ئافرەتەکەو دروسـتکردنی ( شێودیەك ) کە لە توێیەوە نووسـەر توانیویـەتی بەگێڕانەوە و بە هەسـتێکی دروستی بزورتنەوەی گێڕانەوەکە سەرکەوتن وەدەستبهێنـێت .

کاتێك —چیرۆکەکە لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکالە بۆستن و نیویۆرك و واشنتندا پێشوازییەکی گەرمی لێکرا سەبارەت بەوەی کـە نووسەرێکی سەرکەوتووە — ئەگەرچی ڕەخنـەی زۆریشی لێگیرابوو — .

بەمە توانیی لە دەرەوەی وولاتی خۆیدا ناوبانگی وەدەست بێنێت کەم کەس ئەو ناوبانگەی هەبووبێت .

لە کاتێکدا گەڕایەوە بـۆ ئەمریکا دایکی مرد ، گەڕایەوە بۆ ئنگلتەرەو بانگ کرایەوە بۆ بۆستن تا باوکی لە سـەرەمەرگدا ببینێـت .. بـووە چاودێری بەجێ هێنانی وەسیەتی باوکی ، پاش ئەوەی میراتیەکانی باوکی بەڕێکی دابەش کرد ، جارێکی تر لە ئۆقیانووس پەڕییەوە .. ئەمجـارە (٢٠) سـاڵ لـە دەرەوەی وولانەکەیدا مایەوە .. دەستهانێکی کەمی لـە میراتی باوکی بۆ وەجێ مابوو ، بەڵام ئەو سەرکەوتنەی لـە ڕێی نووسینەوە وەدەستی هێنابوو ، ووە هۆی ئەوەی دەست بەرداری میراتەکـە بێت و بۆ خۆشکەکـەی بەجـێی بهێڵێت ، .. بـەردەوام بوو لـە ڕێی قەڵەمەکەیەوە ژیان بەرێتەسەر .

★ ★ ★

پاش ئەمانەی باسـمان کردن ، ئێسـتا هنری جیمس لە قۆناغی دووهەمی بەرهەمەکانیەتی ، لـەم قۆناغەیدا ، هەوڵدانەکانی بۆ دۆزینەوەی ناوەرۆکـی نوێیـە ، بێزاربوو لە ناوەرۆکە « عالەمیـەکان » هەستی دەکرد کە لێی بووەتەوە ، بە گوڕو جۆشێکی سەرسوڕهێنەرەوە لە سێ سـاڵدا دوو چیرۆکـی درێژی نووسـی ( دانیشـتووانی بۆسـتن )

The Bostonians) ، ( شاژن کازاماسیا The Princess Casamassima) .

چیرۆکی یەکەمی لە دەوری پیاوەکانو ڕێنیشاندەرانی نیوئنگلەند ـ دا دەسووڕێتەوە .. چیرۆکی دووهەمیشی جۆرێکی دیە لە ڕێنیشاندەران ، کە زیاد ترسناکترن ، ئەویش ئاژاوەسازەکانی ئەوروپان ..

ئەم دوو چیرۆکە تا ڕادەیەك ، چیرۆکی دوو شارە : بۆستن‌و لەندەن .. دوو چیرۆکی کۆمەڵایەتین، تا ڕادەیەکی گەلێك ڕێك‌وپێك نیگای ژیانی شاری کێشاوە ، لە هەمان کاتیشدا ئەم هەوڵدانەی جیمس نەخشەی ووردی بۆ کێشاوە کە چیرۆکی (سروشتی) بنووسێت ...

لە ساڵی ١٨٨٤دا سەردانی پاریسی کرد ، باسە دوورودرێژەکانی لەگەڵ ( زۆلا )و ، ( ئەدمون دی جۆنکۆر )و ، ( دۆدێە )دا ، شوختێکی قووڵی لە ناخیدا بەجێ‌هێشت ... بە هەر جۆر ، ئەم جاریان هنری جیمس ، نەیتوانی داچۆڕێتە نێو ناخی خوێنەوارانیەوە ... جەماوەر چاوەڕوانی چیرۆکی دیان دەکرد باسی ئەو ئەمریکیە زیرەکانە بکات کە لە ئەوروپادا دەستەوئەژنۆ دانیشتوون ، هەروەها باسی ئەو بێکانە گەڕیدانە بکات کە لە ئەمریکادا دەسووڕێنەوە ، وەکوو چیرۆکی « باری سەرنجی The Point of View» .

لەباتی ئەمانە جیمس وێنەیەکی واقعی ئافرەتانی بۆستنی پێشکەش بە خوێنەواران کرد ، ( ئەو ئافرەتانەی داوای هاوسانییان دەکرد ) ، وێنەی رادیکالیەکانی لەندەنیشی بە هەمان بۆچوونی خۆی سەرنجی‌دەداو وێنەی دەکێشان ..

ئەم جۆرە چیرۆکانە ڕەزامەندیی خوێنەوارانی لەسەر نەبوو تا سەردەمی ( ئەدواردی ) کە دوو نوێنەری چاکی ئەم جۆرە چیرۆکەن کە ناویان .. ( نۆریس Norris ) و ( دریزەر Dreiser ) • .. هەوڵدانی جیمس بۆ ڕەچەگرتنی چیرۆکی ئەمریکی لەسەر هەمان ڕچەی چیرۆکی ئەوروپی‌و لەسەر شێوەی زۆلا ، بووە هۆی ئەوەی جەماوەری خوێنەواری خۆی ، لێی ببنەوە ، بەم شێوەیە ئەم دوو چیرۆکەی سەرنەکەوتن‌و نۆچدادانێکی خراپی جێ‌هێشت ..

جارێکی تریش جیمس هەوڵی‌دا ، ئەم جارە لەسەر دنیای هونەر چیرۆکێکی نووسی گیروگرفتی گەنجێکی سیاسی‌و وێنەکێشی تۆمارکردو ناوی چیرۆکەکەیشی (The Tragic Muse) ەو لە گۆڤاری ( ئەتلانتیك مۆنثلی )دا بڵاوکرایەوە ، ئەمیش سەرکەوتنێکی زۆر کەمی وەدەستهێنا ، سەرەڕای ووردەکاریی لە نووسینیدا ..

هنری جیمس لەباری سەرنجە (تەجریبییەکەیەوە) بۆ چیرۆك ، لە گۆڕین زیاتری‌کرد ،

ناوەرۆکە بنەڕەتیەکانی :

« مەزهەبی ( طبیعی ) هەوڵی‌دەدا ، گواستنەوەیەکی ( حرفی ) تووڕەیی‌و سۆزە سەرەتاییەکانی دەکرد ، بەڵام ئەوەی هنری جیمس کردی زنجیرەیەك بوو لە لێکۆڵینەوەیەکی گەورە بۆ کەسانێك کە، هێزو بزوتنەوە دەستی بەسەرداگرتووە، کە کەسەکە دەستەڵاتی بە سەریدا نییەو ، ئەو زۆرانبازییەی نێوان ( مزاج )و ( بیئە ) کەسەکە دەهاڕێت ، .. ( حتمیە )ی جیمس لە گەوهەریدا سایکۆلۆژیە بەڵام لە لای ( زۆلا ) مادیە » .

لە ساڵی هنری جیمس ڕووبەڕووی ئەم ڕاستی‌یە بووەوە ئەویش گەر ماوەیەکی زۆر سەرکەوتنی وەدەستهێنابووو ناوبانگی دەرکردبوو. ئەوا ئیستا بۆ چەند جارێك لەلای جەماوەری خۆیدا تووشی نۆچدادان بووە .. بەڵام سەرەڕای ئەمە دەیزانی هیچ کاتێك وەکوو ئێستای هونەرمەندێکی بەهرەدارو ڕەسەن نەبووە ، لەو سەردەمەدا سێ چیرۆکی مەنی نووسی ، ئێستا دەزانین ئەو چیرۆکانە زیاتر بۆ نەوەکانی داهاتوو نووسراوە لەوەی کە بۆ سەردەمی خۆی نووسرابێت .. دەستهاتی لە نووسین کەم بووەوە .. ناچاربوو بە نوویی چارێکی ئەم نەهامەتیەی‌بکات‌و ڕوو لە شانۆ بکات ..

لە پێنج ساڵی داهاتوو ١٨٩٠ ـ ١٨٩٥ دا ، حەوت شانۆگەریی نووسی ، دوانی لەسەر شانۆدا نوونرا ، یەکێکیان دەستکاریی چیرۆکی (ئەمریکی‌یە)و گۆڕینە بۆ شانۆگەری‌و بۆ ماوەیەکی کەم نوونرا ..

دووهەمیشیان ناوی ( گی دومڤیل )ە – Guy Domville .. شانۆگەریەکی مێژوویی‌یە بە وەستاکاریەکی لەبارو شاردزایانە نووسراوە ، لە ساڵی ١٨٩٥دا جۆرج ئەلکسەندەر « بەڕێوەبەری شانۆیی لەندەن ـ پۆ » دەریهێنا ..

بینەرانێکی بەد ڕەوشت بەلیکەو هەرا

پێشوازی ئەم شانۆگەرییەیان کرد ، ڕ قی خۆیـــان تفانده سەر جیمسەوە کە لە شـــەوی یەکـەمی نواندنیدا ، هەڵسا خێرهاتنیانی‌کرد ...

جیمس پشتی لـە شانۆ هـــەڵگرت‌و بـــۆ چیرۆکنووسین گەڕایـەوە ، پاش ئـــەوەی بینیی جەماوەرەکەی بە ئاشکراو بە توندی ڕەفزی‌دەکەن ..

کاتێك پشتی لە شانۆو جەماوەرکردو لە لەندەن کشایەوە ، پاش ئەوەی چەند ساڵێك لە شاردا ژیانی بەسەربرد .. لە سەرتادا خانوویەکی بەکرێ گرت ، پاشان لە ( ڕای ) لە هەرێمی سکس خانوویەکـــی کڕی ، لەم ماڵەدا دوابەرهەمی وەئەنجـــامهێنـــاو هەروەها لەو ئێش‌و ڕەشبینییە قووڵەی ڕزگاری‌بـوو کە تۆچدادانەکانی بیووە هۆی ئەم ئازارەی کە جەماو.ر بایەخی بە هونەرەکەی نەدەدا .

لەکاتێکدا ئەو چیرۆکە سەرنەکـــەوتووەکانـــی دەنووسی‌و لە شانۆیشدا موغامەراتی دەکرد ، لـەم کاتەدا هەندێك چیرۆکی کورتی لە پەراوێزدا دەنووسی .. ئەم کاتەی بـــە پێـــەی بەهرەی هونـــەری لەقەڵەم‌دەدرێت ئەمیش بە جوانی لـە ( کاغەزەکانی ئسبرن ) دا دەرکەوێت کە لـــە ســـــاڵی ١٨٨٧دا بڵاوبووەوە ، لـــە چیرۆکـــی قوتابی ــ پشـــدا ــ The Pupil ئەم دیاردەیە بە ڕوونی دیارە .. ئەم چیرۆکەیش لە ساڵی ١٨٩١دا لەسەر شانۆدا نوێنرا .. لـەم کاتانـــەدا جیمس دەستی بـــە نووسینی زنجیرەیەك چیرۆك کرد بە ئاشـکرا ئـەوەی تیـــادا دەردەکەوێت کە تەرجەمەی خودی خۆیەتی، هەروەها لەم چیرۆکانەیدا باسی ئەو نووسەرانە دەکات کـە خۆیان دەزانن گـــەیوو بوزرگن بـــەڵام ناتوانـــن پیویستیەکانی خوێنەوارو هەندێك نەریکە رەخنەگر بەجێ‌بێنن ...

ئەو چیرۆکانەی جیمس کە پاش تۆچدادانـــی چیرۆکی ( گی‌دۆمڤیل ) .

بڵاوبوونەوە هەتا سەرەتای ئەم سەدەیە ئەوەمان نیشان ددات کە لە هەموو سووچ‌و پەنایەکەوە خۆی بە تاقی‌کردنەوە تێ‌دەپەڕان ، هەتا ئەو ناوەڕۆکانەیشی هەڵدەبژارد کە ڕەنگی کێشەی کارەکانی دەدایەوە .. مەبەست ئەو هەستەیە کـە تووشی تەنگەتـــاوی‌ی کردبوو ، لەبەر ئەوەی نووسـەرێکە « وون بـــوو » سێبە ریشی سووك نییە لە دنیایەکی نەفام‌و کـــەم بایەخدا ..

کاتێك لە چیرۆکە ڕەمزییەکانی دەبووەوە کـــە لەسەر نووسەرە سەرنەکەوتووەکـــان دەینووسی ، دستی بە نووسینی حیکایەت دەکردو لەسەر خێو تارماییەکان دەینووسی .. لەڕاستیدا زۆربەی ئەو حیکایەتانەی کە باس لەم ناوەڕۆکە دەکات بەرهەمـی ئەو سەردەمەیەتی کە بیووە لانەی تارماییەکان ..

زنجیرەیەك چیرۆکی لەسەر منداڵی‌و هەرزەکاری نووسی لە نێوان ساڵانی ١٨٩٥ ــ ١٩٠٠ دا لە واقعدا دووبارە نووسینەوەی ئەو ناوەڕۆکانەیە کە باســـی بەرائەت دەکات لە جیهانی بۆگەندا ..

بەناوبانگترین چیرۆکـــی ئـــەم بابەتـــــەی (Tne Turn of the Screw) ە کە ( عنصر ) ی تارماییەکان لە بیری منداڵیدا کۆدەکاتەوە .. جیمس ئەم چیرۆکەی لە حیسابی خۆی داگرتووە چونکە بە پووچ‌و کەم بایەخی دەزانێت ... جارێکیان لـــەم بارەیەوە بە هاولز ــ ی ووت کە « کرنووش بردنە بە چوار پەل لەپێناوی ناندا » بەڵام سەرەڕای ئەمـــە مێشکی خوێنەوارانی ڕاکێشاو ، تا ئێستاش هەمان توانای ماوە ...

هیچ چیرۆکێکی جیمس لەنێو ڕەخنەگرەکانـــدا ئەوەندەی ئەم چیرۆکە نەبووە مایـــەی گفتوگـــۆو لەسەرووتن‌و نووسین‌و ، هەریەکەو ویستوویەتـــی ڕای خـــۆی بسەپێنێت‌و ئـــەوە بسەلمێنێت کـــە تەفسیرەکەی ڕاستترە .. لـــە ڕاستیـــدا هـــەر خوێندنەوە جۆرە تەفسیرێکی تری بکات ..

لەچەند جارێك زیاتر جیمس لەبارەی ئـــەم چیرۆکەوە ووتوویەتی : ( بە مەبەست ئاڵۆزم‌کردووە ، تا وا لە خوێنەوار بکەم ترسە تایبەتییەکانی خۆی بێتە بەر چاوی ) . ئەم ڕایەشـــی لەســـەر ئـــەو تیورە بنیات‌ناوە کە دەڵێت :

مۆتەکە زیاتر سامناکتر دەبێت گەر کەسێـــك خەونی پێوە ببینێت و ، بەم ڕێیە تـوانـــی بنلفەی هاوبەشی داڕێژێت لەنێوان نووسەرو خوێنەواردا ..

ئەو دایەنەی بووەتە مەڵبەندی تارماییەکـــان ، چیرۆکەکە دەگرێتەوە بەڵام شتێکی کــــەمی ڕاستی‌ی بینراو دەداتە ددستەوە ، ئیتر خوێنەر لە ئاستێکـی سەیردا خۆی‌دەبینێت ، ئەوەی دەبگێڕێتەوەو شێوەی گێڕانەوەکەی دەبێتە مایەی ئەوە خوێنەر بڕیاربدات لە ڕاستی‌و درۆی ئەم شایەدیەی ئەم دایەنە .

هنری جیمس بەم چیرۆکە دەڵێت : ( داوی

گەوج ) لەبەرئەوە زۆربەی خوێنەرانی دەبنە نێچیری ، هێزی گێڕانەوەکە و قسەکانی دایەنەکە بە لایانەوە جێیەکی چاك لە دەروونیاندا داگیردەکات ، بەڵام گەر خوێنەر لێی ووردبێتەوەو سەیری شاهیدی دایەنەکە بکات دەبینێت ، بێ‌پێزویەك نەگرتووەو ، ئەو زمانەی دایەنەکە پێی دەدوێت پڕە لە خەیاڵاتی سەیر ، ئەمیش ئەو دردەخات کە ترسە تایبەتییەکانی خۆی دەردەبڕێت ..

لە قسەکانی دایەنەکە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەدوو منداڵەکە تارماییەکان نابینن وا دەستەڵاتیان بەسەرداگرتووە . خوێنەریش بە وەعی یان بێ وەعیەوە ترس لە دوو شت دەستی‌بەسەردادەگرێت :

یان بەشداری‌ی دایەنەکە بکات لەو ترسەی کە دوو منداڵەکە ڕەنگە بکەونە بەر نەفرەتی بینینی تارماییەکانەوە یان لەوە بترسێت کە دوو منداڵەکە لە ژێر چاودێری‌ی ئەم دایەنەیە کە بووە بە نێچیری (قلق) و ئەم جۆرە تارماییانەو ئەم (تاریکی‌و بلێسانە).

هنری جیمس لە هەموو چیرۆکنووسەکانی ئەم جیهانە زیاتر لەم چیرۆکەیدا قووڵی‌و پتەوی لەنێو چیرۆکێکدا کۆکردووەوە .. ئەم چیرۆکە تیورە گەییوەکەی جیمس لەسەر تارماییەکان روون‌دەکاتەوە بە ڕای جیمس : ـ

« مەرج نییە ترس‌و ئاڵۆزی لە دەوری تاوان‌و پیاو کوژیدا بسووڕێتەوە ، هەروەها بە دەوری قەڵای تاریك‌و زنجیرو خوێن‌و دەرگا سیحراوییەکان‌دا بسووڕێتەوە ، مەرج نییە ترس‌و ئاڵۆزی لە دەوری ئەوەدا بسووڕێتەوە کە لە نیوە شەودا بەتەنیایی وەکوو فرانکشتین کەسی بسووڕێتەوە ... » تارماییەکانی جیمس لە ڕۆژی ڕۆشنداان ، جێیە ترسدارەکانی دادەهێنێت‌و کارێکی وا دەکات ئەوەی کە ئاسایی نییە لە پەراوێزی ئاساییدا ڕووبدات ، بەم پێیە ترسکە زیاددەکات ..

لە ڕاستیدا ئەوەی جیمس ئیزافەی کردووەتە سەر چیرۆکی تارماییەکان،زنجیرەیەکە لە لێکۆڵینەوەی زێرەکانە بۆ جۆری ( قلق ـ ی ) ئینسانی ، بەتایبەتی توانای ئادەمیزاد دەردەخات کە خۆیان ئاڵۆزبکەن بە تارمایی، ئەویش کە لە داهێنان‌و دەستکردی خۆیانە..

لەو چیرۆکانەی کە لەسەر منداڵی نووسیویەتی چیرۆکی « ئەوەی ( میزی ) دەیزانی » What Maisie Knew ، چیرۆکی منداڵێکی چکۆلەیە لەنێوان دایك ـ ی تەڵاقدراوی‌و باوکیدا ئەم سەرو ئەو سەر دەکات ، هەریەکە بۆ ئەوی دی وەکوو تۆپی تەنیس هەڵیدەدات ، لە توێی ئەمدا چیرۆکەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەم کچۆلەیە دەیەوێت داچۆڕێتە ناخی رەوشتی سەرسوڕهێنەری ئەم دنیایەی تیایدا دەژین ...

چیرۆکێکی دیشی لەم بابەتە هەیە بە ناوی ( لە تەفەسدا ) « «In tne Cage» » چیرۆکی کچە هەرزەکاریکە ، لە پۆست‌و تەلەگرافدا کاردەکات ، دیەوێت لە خەیاڵیدا وێنەی ئەو جیهانە پێشکەوتووە بکێشێت کە تەلگرافەکانی لەنێوانی دەستیدا تێدەپەڕێت .. هەروەها چیرۆکی ( ئەوەی بێ کەڵك ) The Awkara Age ، چیرۆکی کچە هەرزەکارێکە دەگاتە تەمەنێ دەتوانێت پرچەکەی داهێنێت‌و ریکیبخات لە ڕۆژی پێشوازیدا دەچێتە نێو گەورەکانەوە :

لەم کاکڵەی ئەم چیرۆکانەدا جۆرە حەزێکی منداڵانەی تیادایە ، حەزەکانیشیان لە دەوری سێکس‌و ڕەوشت‌و ڕەفتاری ژیانی گەورەکان دەسووڕێتەوە ..

جیمس لە گەلێك جاردا وێنەی حەپەسان‌و ترسی ئەو گەنجە هەست ناسکانە دەکێشێت ، کاتێك کە ئەم ژیانە دەبینن‌و خۆیانیش ئاستی هەوڵدان بەدی‌دەکەن کە توانای ئەوەیان تیادایە بە تاقی‌کردنەوەیدا تێپەڕن .. بەڵام بێ توانان بە چاکی تێ‌ی‌بگەن .

ئەگەر ناوەرۆکەکانی ئەم چیرۆکانە ڕەنگدانەوەی نۆچ‌دادانی هنری بێت لە حاڵەتی بەکەمیدا کەپڕە لە ڕاڕایی‌و سەرسوورمان . لە کاتێکدا هەوڵی‌دەدا داچۆڕێتە نێو ناخی هەرزەکارانەوە ..

ئێستا دووهەم هەوڵدانیەتی ، لەبەر ئەوەی عالەمی رەفزیەتی هەروەها ئەم چیرۆکانە ئەوەمان نیشان دەدات کە بەرپەرسیەکی ووردی هونەرمەندێکی شاردزایە بۆ ( اصول ) ی ژیانی سکس ئنگلنەرای فیکتۆرییە ...

داهێنانە تەکنیکیەکانی ئەم چیرۆکانە لە ناوەرۆکەکانی بەبایەخ ترە ، جیمس هەوڵی‌داوە ڕێ‌ی نوێ بدۆزێتەوە بۆ گێرانەوەی چیرۆك‌و بتوانێت بە ووردی هەستی منداڵی لە کاتی بێ‌ئاکایی بگوازێتەوە، بۆئەوەی ئەمە وەئەنجام‌بێنێت زۆر جار پەنای‌بردووەتە بەر ئەو وانانەی کە لە شانۆدا

فێری‌بووه :

یانی ئاشکراکردنی باسی لە توێی نیگاو بەکارهێنانی دیالۆگی . موزدەوەج وەکوو ڕێیەك بۆ گێڕانەوەی چیرۆکو دووربینی‌ی نووسەرو ئاگاداری‌ی لەو هەموو کارانەی خۆی وەکوو درکاندنو تەعلیق.. ئەمەیش جۆرێکە لە دابەش‌کردنی ئەرکو دەیسەپێنێتە سەر خۆێنەواردا هەولی دۆزینەوەی ڕووداوەکانی چیرۆکەکە بداتو گرێ کوێرەکانی بکاتەوەو بزانیت چی‌تر ڕوودەدات .. ئەمە ڕێگەیەکە بۆئەوەی خوێنەوار ببێت بە نووسەر ..

★ ★ ★

جیمس گەیشتە قەناعەت کە ( بایەخی بێ‌هاوتا ) لە دوا بەرهەمەکانیدا دەبینرێت ئەویش لە سالأنی ١٩٠٠ تا جەنگی‌یەکەمی جیهانیەوە دەستپێ دەکات .. سێ چیرۆکی گەورەی نووسی لەنێوان سالأنی ١٩٠٠ و ١٩٠٠ دا . کە سەر لەنوێ ناودرۆکە جیهانیەکانی لە ئاستێکی بەرزدا داڕشتەوە ، بەئەزیەت خوێنەر لەم چیرۆکانەی حالی‌دەبێت گەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو تەکنیکانەی لەسەردەمی پێ‌گەیشتنیدا نەبێت .. شێوەو ناوەرۆك گیرسانەیەکدیەوە .. لە کۆتاییدا درامایەکی سایکۆلۆژی‌ی جوانترین کۆمیدیاو گالتەجاری پێشکەشکردین ئەویش لە چیرۆکی ( بالوێزەکان ) دا The Ambassadors ، پاشانیش چیرۆکی تراجیدیای تێ‌فکرینی نووسی لەژێر ناوی ( بالەکانی کۆتر ) دا – The Wings of the Dove هەروەها چیرۆکی ( لەگەنی زێڕین ، The Golden Bowl دەتوانرێت بە جوانترین چیرۆکی جیمس بژمێرین لە ئادابی ڕەوشتدا .. ( بالوێزەکان ) لە سالی ١٩٠٣ دا بلاوکرایەوەو لە سالأنی ١٨٩٩ ـ ١٩٠١ دا نووسیویەتەوە :

باری سەرنجی خۆی وا دەردەبڕێت ( ڕۆمانی چیرۆك لە چەند گۆشەیەکی ڕۆیای جۆراو جۆرەوە ) ڕێچکەکەیشی لە دووبارەبوونەوەی نیگاکاندا ڕاستەڕێ‌دەگرێت ، وا لە خوێنەوار دەکات لەگەل شەخسیەتێکی تایبەتی چیرۆکەکە هەلچێتو هیچی بۆ نەدرکێنێت تەنیا بەقەد ئەوەی لەو ساتەدا شەخسیەتەکە بەدی‌ی‌دەکات لە دووباردبوونەوەی جوولەو وێنەو لە گۆشەی چیرۆکەکەدا تێ‌فکرێتو تەحلیلی شەخسیەتەکانی بکات .. جیمس لەم بوارەداو لە مێژووی چیرۆکدا جوانترین چیرۆکی بێ هاوتای داهێناوە ...

کاکلەی ئەم چیرۆکە :

باوەڕی گەیبوی جیمس دەبینین کە دژیان ـ عملیە ـ ی بینینە ، لە توێی دەرککردن بە شتەکانی دەوروبەر، باودڕ پەیدادەکەین ، اڕیشی وایە کە مرۆڤ گیان‌لەبەرێك بێتو میراتی زۆر شت سەپێنرابیتە سەریەوە لەگەل ئەمەشدا دەتوانێت دلی خۆی خۆشکات بەوەی کە بەوڕینەکردن سەربەستە یان وا بزانێت سەربەستە بەم شێوە جیمس باوەڕی وایە پێویستە لەسەر ئینسان ( استغلال )ی ئەم وڕینانەی خۆی بکات ) .

لە چیرۆکی بالەکانی کۆتردا دەیویست چیرۆکی کچێکی دەردەدار بنووسێت ( نەخۆشیەکەی نادیاری بوو ) بینی‌ی نابێت چیرۆکەکەی لە دەوری مردندا بسووڕێتەوە ، بەلکوو دەبێت بایەخێکی گرنگ بە هونەر بدات ، دەبینین بە ئەندازەیەکی ڕێك‌وپێك نیگاکانی چیرۆکەکەی دەرد.خات خۆێنەواری دوورخستووەوە لە وێنەی ( میلی ئیل ) کە لە سەرەمەرگدایە ، تەنیا لە هەندێك کاتی تایبەتیدا ، ئەویش کە دەیەوێت ورەی بەرزکاتەوەو سووربێت لەسەر ژیان .. لە چیرۆکەکەدا ڕۆشنایەکی زۆری خستووەتە سەر کەسەکانی دەوروبەری‌و سەر ئەو داوەی کە هاوڕێکانی بۆی دەچنن ئەویش دەزگیرانێکی بۆ بدۆزنەوە تا ببێت بە میراتگری ، پاش‌مردنی کچەکەش سەربەست‌بێتو بە ئارەزوو چ کچێکی بوێتو بیخوازێت ...

جیمس لەسەر ئەو وێنانەی نەنووسی کە بەقارەمانەکەیەوە بەسترابووو لەسەرەمەرگیدا بوو ، چونکە ئەم جۆرە وێنانە چیرۆکەکەی دەگۆڕییە سەر ئەو جۆرە چیرۆکانەی سۆز دەجوولێننەوە، کەسەکان، ڕووداوەکان پاش ڕوودانی دەبیستن ..

بلزاك هەولی‌دا هەندێك چیرۆك داهێنێت لە هەمان کاتیشدا ببێت بە (لێکۆلینەوەیەکی فەلسەفی)و لە چوارچێوەی ( کۆمیدیای ئینسانی ـ دا بێت ) بەلأم ئەمانەی چیرۆکی لاواز ، کەچی جیمس بە چاوی ڕێزو گەورەیەوە سەیری‌دەکرد.. لەدوا بەرهەمەکانی جیمسدا دەبینین ڕێزێکی گەورەی بۆ ئەم چیرۆکانە.. یان مەبەستی ئەم چیرۆکانە هەیە ..

دەلیلیش بۆ ئەم ڕێزەی لێکچوونی ناوی

قارەمانەکانیەتی « لویس لامبرت ستریدز » لەسەر ناوی ( لویس لامبرت ) تە یەکێك لە قارەمانەکانی چیرۆکەکانی بلزاکە .. ئەم پەیوەندیبە قوولتردەبێت لە چیرۆکی ( باڵەکانی کۆتر ) و یەکێك لە چیرۆکەکانی بلزاك کە لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفییە ) و چیرۆکێکی سوید نبورغییە ( سوید نبورغ ، فەیلەسوفو زانایەکی سروشتیو صوفییەکی سویدیە ١٦٨٨ – ١٧٧٢ ناوی چیرۆکەکە سیرافیتا ـ یە Seraphita ئەم چیرۆکە ( ییتس ـ ی ) شاعیری مەستکرد ..

وەعیەکی مەسیحییانەی بەرز دەستی بەسەر چیرۆکی سیرافیتاو باڵەکانی کۆتردا گرتووە .. هەردوو چیرۆکەکە باسی ئافرەتێکی گەنج دەکات خۆی بەختدەکات وەکوو خۆبەختکردنی مەسیح، سیرافیتا دەڵێت :

( لێرەدا دووریێ هەیە بۆ مردن .. مردن لەلای هەندێك کەس مانای سەرکەوتنەو لەلای هەندێکی تر مانای بەزینو تێشکانە ) . چیرۆکەکەی بلزاك ، صوفییانەیە .. بەڵام چیرۆکەکەی هنری جیمس لەسەر مرۆڤایەتیو خاوێنیو خیانەتو گەورەییو تێشکان ، بنیاتنراوە .. دەتوانین وا بڵێین کە جیمس قەرزاری بلزاکە لە ڕەفریەتی چیرۆکەکانیدا لە هەردوو چیرۆکەکەدا وامان بۆ دەردەکەوێت ، کە هازەی باڵی مەلائکەیەکی گەورە دەبیستین ، هەردوو قارەمانەکەش لە ڕۆخی خەرەندێکیانو لەبەربوونەوەدانو خەریکە لە ژیان جیادەبنەوە ، سیرافیتا حەزیدەکرد باڵی پەیدابکردایەت بۆئەوەی خۆی بپارێزێت ، هەروەها ( باڵەکانی کۆتر ) لە چیروکەکەی جیمسدا دەناڵێتە قەد ئەو کەسانەی هەوڵی ئەوەیان داوە خیانەتی لێبکەن .

جیمس لەم چیرۆکەیدا درامای لەسەر ئنسان داهێناوە لەنێو ئەو یاسانەی کۆمەڵ بۆ خۆیی سازداوەو لە توێی ئەو باوەڕانەی کە بووەتە مایە بۆ دروستکردنی کلیساو شارستانیەت .

ڕەنگە ئەمەش بووبێتە هۆی ئەوەی هەندێك ڕەخنەگر هەوڵی ئەوەیان دابێت لەم چیرۆکەدا مەجازو ئیستعارە وەدەست بێنن ، ئەو ڕاستەیان لەبیرکردووە کە جیمس ئەم جۆرە نووسینەی ڕەفزکردووەو لەسەر ریالیزمیەتی خۆی مایەوە ، دەربەستی شتە بینراوەکانە .. هەوڵدانی جیمس لاساکردنەوەی ( کۆمیدیا خواوەندی ).ینیە بەڵکوو ( کۆمیدیای ئنسانییە ) ..

دوا چیرۆکی جیمس ( لەگەنی زێرین ) بنەمایەکی نوێی خۆشکرد ، وەڵامی ئەو پرسیارە بێ وەڵامانەی چیرۆکەکانی پێشووی دۆزیەوە ، سێگۆشەیەك هەڵدەبژێرێت ـ مێردو کابانو دۆست ـ ئەو گۆڕانەی دەکەوێتە نێو ڕووداوەکە ئەوەیە ـ دۆستەکە دایکی کابانەکە دەخوازێتەوە بەم شێوەیە دایکی کابانەکە دەکاتە قارەمانی خەڵەتاو ... جیمس بەر لە چەند ساڵێك دەیویست لەم بابەتە چیرۆکانە بنووسێت بەتایبەتی لەسەر ( زنا ) کەچی لەبەر ئەوەی ئەو گۆڤارە تایبەتییانەی بە ( خانەوادەکان )ی ئەمریکا وایلێکرد نووسینەکانی لە ئاستی هەرزەکارەکاندا بێت ... لەبەرئەوەی ئەم چیرۆکە بە زنجیرە لە گۆڤارەکاندا بڵاونەکرایەوە بۆیە خۆی سەربەستبینیو دەتوانێت بێترس لەگەڵ باسەکەدا هەڵسو کەوتبکات .. ئەم چیرۆکەو بۆ یەکەم جار باسی کچە ئەمریکییەکی بێگوناە دەکات کە ئاستی بیرکردنەودو دەرکی زیاددەکاتو لە کۆتاییدا نەك تەنیا ( شوو ) ەکەی دەگەڕێنێتەوە ئامێزی بەڵکوو بەسەلامەتی لەو پەیوەندیبە ترسناکەی نێوانی خۆیو باوکی دەربازدەبێتو باوکی دەگەڕێنێتەوە لەگەڵ ژنە گەنجەکەیدا بۆ ئەمریکاو خۆی لە ئەوروپا دەمێنێتەوەو بۆ داهاتووی نەخشە دەکێشێت ..

★ ★ ★

هنری جیمس کە تەمەنی گەیشتە حەفتا ساڵیو لە ساڵ ڕۆژی لەدایکبوونیدا ، ئەو جیهانەی بە ئنکلیزی دەدوێت ئاهەنگیان بۆ گێڕا ..

ئەو هەوڵدانە دامر کێنرا کە خەڵاتی نۆبل ـ ی بدەنێ بۆیە ( ٢٥٠ ) هاوڕێی لەگەنێکی زێڕینیان پێشکەشکردو داوایان لە ( جۆن سنجر ساجنت ) کرد لە تابلۆیەکدا نیگای بکێشێت ..

ئەم تابلۆیەش ئێستا لە پێشانگای وێنە نەتەوایەتیەکانی لەندەنە ..

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم ، جیمس خۆی بەزۆر شتەوە خەریککرد ، سەردانی نەخۆشخانەکانی دەداو یارمەتی پەناهەندەکانی دەداو لە نووسینەکانیدا پشتگیریی ئەو (کتیبە ئەمریکیەی) دەکرد کە لە فەرەنسا یاریدەی بریندارانیان دەدا .. لە ساڵی ١٩١٥ دا لەکاتی نەخۆشیو ئازارەکانیدا

بڕیاریدا ئەو ناسنامە ئەمریکییەی کە چل سال پاراستوویەتی‌و لە ئنگلتەرە ماوەتەوە ، بیکوڕێتو چارەنووسی خۆی بە مەسەلەی بەریتانیاوە ببەستێت، پاش سێ چوار مانگێك دووچاری نەخۆشییەکی قورس بوو تا سالی ١٩١٦ ، مەلیکی ئنگلتەرە جۆرجی پێنجەم میدالیای ( ئستحقاق ) ی پێبەخشی ...

دیاریش‌بوو کە هیوای چاكبوونەوەی لێناکرێت تا لە ٢٨ ی شوباتدا بۆ یەکجاری چاوی لەیەك ناو .. تەرمەکەیان گواستەوە بۆ ئەمریکاو لە گۆڕستانی کمبرج بەخاك سپێرراو ، لەسەر کێلەکەیدا ئەمە هەلکۆلراوە :

( لە هەردوو دیوی ئۆقیانووسدا ، تەرجومانی هەستی نەوەکەیەتی ) .

★ ★ ★

جیمس لە سەرەتای ژیانی نووسینیدا ، نامە نووسێکی وەریابوو بێزار نەدەبوو ، ئەم نامانەش بەرهەمێکی گەلێك گەورەی ئەم نووسەرەیە ، پاش ئەوەی لە کاری رۆژانەی تەواو دەبوو ، بە خەیالێکی کراوەوە دەستی بە نامەنووسین دەکردو (١٠) هەزار نامەی بۆ جێهێشتووین‌و زۆربەیان بلاونەکراوەتەوە ، ئەو نامانەی کە پەیوەندی‌یان بە کارەکەیەوە هەیە لە هەمان بایەخی ئەو نامانایەکە بۆ هاوڕێکانی نووسیویەتی‌و پڕە لە تێبینی لەسەر خەلك‌و ئەو شوێنانەی کە بینیویەتی ..

جیمس هاوڕێی زۆر بوو ، شوێنێ نەما لە دنیای ئەدەب‌و هونەردا باسی لێوەنەکردبێت .. لەگەل زۆربە نووسەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەدا هاوڕێیاتی‌بووە .

لەو نووسەرو ڕەخنەگرو وێنە کێشانەی کە پەیوەندی‌ی بەتین‌و گەرمی لەگەلدابوون :

ڕۆبەرت براونىج ، ڕۆبەر لویس ستیفنون ، ئەدمۆند جۆسی ، ئەلفۆنس دۆدیە ، ئیڤان ترجنێف ، بۆل بۆرجێە ، جۆرج دی‌مۆرێیە ، جۆن سنجر سارجنت ، جۆن لافارج ، ئەمیل زۆلا ، جۆل جران، مسز هەمفری وارد ، جوزیف کۆنراد ، ﻫ . ج . وێلز ، ڕۆدیارد کبلنج ، ئەدیث وارتون ، ماثیو ئارنۆلد، بالر ، تنیسۆن ، جۆرج ئەلیوث ، ولیەم مۆریس ، جۆن رسکن ، لامرسون ، نۆرتۆن ، هاولز .

دەستەلاتی بەسەر ئەدەبی ئەمریکیدا لەزیادبووندابوو سەبارەت بەوەی لە‌وپۆپی ژیانی ئەدەبی‌ی لە پەرش‌وبلاوبوونەوەدابوو ، گەر بەراوردبکرێت لەگەل ژیان‌و بەرهەمی چیرۆکنووسەکانی دی‌ی ئەمریکادا ..

هنری جیمس کەلە ناودارێکی ئەدەبی جیهانیەو پردێکی ڕەسەنە ، جیهانی ئەدەبی لە بزووتنەو ی ڕۆمانتیکیەتەوە گواستەوە بۆ ئەوەی کە نوێیە لە دنیای ئەدەبی سەدەی بیستەمدا .

نووسەری ئەم لێکۆلینەودیە

لیۆن ئێدل :

لە شاری بتسبرگ لە ولایەتێکی بنسلڤانیەی ئەمریکی لەدایك بووە ، خوێندنی لە کەنەداو لە دانیشگای سۆربۆن لە پاریسدا تەواوکردووە . ئێستا لە دانیشگای نێویۆرکدا مامۆستای ئەدەبی ئنگیزی‌و ئەمریکیە ، چەند نووسراوێك‌و چەند لێکۆلینەوەیەکی بەناوبانگی هەیە لەسەر کەلە نووسەرە ناسراوەکانی وەك هنری جیمس ، جیمس جوێس ، زۆربەی زانستگاکانی ئەمریکا داوای‌دەکەن ببێت بە مامۆستای ( سەردەر ) ئەو زانستگایانەش : هارڤارد ، هاوای ، ئەندیان‌و برنستۆن ن ..

# شانۆگەری

# (یۆشای)

## یۆجین ئۆنسکۆ نووسیویەتی
## اکرم علی کردوویە بە کوردی



« کەسانی شانۆییەکە »
هاوڕێ ، ئەندامی کۆڕی زانایان ، ژنەکـــەی ، کارەکەرەکەیان .

بۆ یەکەمجار لە (٧)ی مارتی ١٩٦٦ لە دەرهێنانی ( جان ـ لوی بارو ) و دیکۆری ( جاك نویل ) لەسەر شانۆی ( ئۆدیون دوفرانس ) پێش‌کەش کراوە .

ـ دیکۆر ـ

ژووری میوانی مالـــە بۆرژوازیەکـــە .. دەستێکی هونەری پیا هێنراوە قـەنەفەیەك یان چەند قەنەفەیەكو چەند کورسیەکـــی نەرمو شل یەکێکیان ڕەنگەکەی سـەوزە لـــە کورسی پاشـا دەچێت لـــە ناوەڕاســـتی ژوورەکەدایە .. دیوارەکانی ژوورەکە بـــە ژمارەیەکی زۆر بڕوانامـــەی جۆراوجـــۆر داپۆشراوە ، بە خەتـی گـــەورە لەســـەر هەندێکیان نوسراوە ( دکتۆرای فەخـــری ) خەتەکانی تر بە وردی نوسراون بە ئاسانی ناخوێنرێنەوە .

چەند بڕوانامەیەکـی بچووکتر هەلواسراون لێیان نووسراوە ( دکتۆرا .. دکتـــۆرا .. دکتۆرا .. )

دەرگایەك لای ڕاستی بینەرانەوە هەیە .

پەردە لادەدرێت ، ژنی ئەندامی کۆڕ بە جلو بەرگی نووستنەوە وەستاوە لـــەوە دەچێت تازە لە خەو هەستابێتو هێشتا فریـــای خۆگۆڕین نـەکـــەوتبێت .. هـــاوڕێی خێزانەکەیان لەبەردەمیا وەستاوە بەرگێکـی کەشخەی پۆشیوە .. شەبقەو چەترەکەیـی بە دەســـتەوە گرتووە .. جـــوتێ پێلاوی ڕەشی لە پێدایە ،

ژن / چۆن ؟ ! هاوڕێم .. خێراکە زوو پێم بلێ .

هاوڕێ / نازانم بە چ شێوەیەك ئەو هەواڵە ئەگریـــەت پێ بڵێم .

ژن / تێ گەیشتم .

هاوڕێ / ئەم هەواڵەم لەدوێنێ‌ئێوارەوە دەزانی بەڵام نەم دەویست بە تەلەفـۆن پێتی بڵێـــم . لەوەندەش زیاتر نەمتوانی چاوەڕێ بکـــەم

ناچار وا زووهاتم داوای لێبوردن دەکەم کە بەم بەیانیە زووە خەبەرم کردیتەوە .

ژن / ئای کە کلۆلین .. نەی توانی لەو نەگبەتیــــە ڕزگار ببێت .. تا دوا چرکـــەش هـــەر هیوامان پتەو بوو .

هاورێ / چاك تێت دەگەم بەڕاستی شتێکی یەکجار سەختو ناخۆشە بەڵام دەبوایە هەرزوو ئەم ئەنجامەمان ڕەچاوبکردایە هەر چەندە چەند فرسەتێکی باشی بۆ دەلواگەر بیکردایە بەڵام ئەو فرسەتانەش هێجگار کەمبوون .

ژن / هەرگیز چاوەڕێی ئەمەم نەدەکرد .. چونکــە ئەو لە هەموو کاریکدا ســەرکــەوتنی بـــە دەستدەهێنا خۆ هەر کە گیرو گرفتێکــی توش دەهات لە دوا چرکەکانیشدا بوایـــە خۆی لێ دەرباز دەکردو سەرکەوتنی بـــە ئاسانی بە دەست دەهێنا .

هاورێ / نەدەبوو لەوکاتی ماندوو بونەیـــدا وازی لێبهێنیتو یارمەتی نەدەیت .

ژن / دەتەوێ چی بلێیت ؟ .. چیت دەوێ ؟ . ئاە .. چەندە شتێکی ستەمە .

هاورێ / ددان بە خۆتدا بگرە هاوڕێی خۆشەویستم ژیان ئەوەهایە .

ژن / لەسەر خۆم نیم دەترسم ببورێەوە . بەسەر کورسیەکدا « دەکەوێت » .

هاورێ / ( گرتوویەتیو بە لەپی دەستی دەکێشێ بە ڕومەتیدا ) بم بورە هەواڵەکەم بە شێوەیەکی دڵڕەقانە پێ ڕاگەیاندیت .

ژن / باشت کرد .. دەبوو هەربتووتایە ، بە هەر حاڵ دەبوایە هەر بم زانیایە .

هاورێ / ئاو دەخۆیتەوە ؟ ( هاوار دەکات ) پەرداخێك ئاو ( ڕوو دەکاتە ژنی ئەندامی کۆڕ ) دەبوایە هەواڵەکەم بە شێوەیەکی ڕێكو پێكتر پێڕا بگەیاندیتایە .

ژن / هیچی لە مەسەلەکە نە گۆڕی .

کارەکەر / (دێتە ژوورێ پەرداخێك ئاو دەهێنیت) چی بووە ؟ ! ئاغا ژنم چی بەسەرهاتووە ؟

هاورێ / ( ئاوەکەی لێ وەردەگرێت ) هیچی وانیە .. ئاوەکەی دەدەمێ ئێستا دێتەوە سەرخـۆی هەواڵە ناخۆشەکەم پێگەیاند .

کارەکەر / کەواتە .. ئاغام ....

هاورێ / ( بە کارەکەر ) بەڵێ خۆیەتی .. کەواتـــە تۆش دەتزانی .

کارەکەر / نەمدەزانی بەڵام لە شێوەی دەمو چـــاوی تۆدا بۆم دەرکەوت .

هاورێ / ئادەی بە دووقۆلی بەجێمان بهێڵە .

کارەکەر / ( لەبەر خۆیەوە ) گوناحە ئاغام . ( دەچێتە دەرەوە )

هاورێ / باشتر بوویت ؟

ژن/ هەرچۆنێك بێت پێویستە دان بە خۆمدا بگرم.. بەڵام من خەمی ئەومە ئەو بەستەزمانە ، حەز ناکەم ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوببێتەوە تۆ بڵێی ڕۆژنامەکان لەم هەواڵە بێ دەنگ بن ؟

هاورێ / ئاسانە .. دەرگاکەت دابخـــەو وەڵامـــی تەلەفۆنیش مەدەرەوە .

ژن / لەگەڵ ئەوانەشدا هەر بڵاو دەبێتەوە .

هاورێ / دەتوانیت بۆ ماوەی چەند مانگێك بچیت بۆ لادێ تا هەموو شتێکت بیر دەچێتـــەوە .. پاشان دەتوانی بگەڕێیەوەو زۆر بە ئاسایی بژیت .

ژن / وا بە ئاسانی بیر ناچێتەوە .. کێ چاوەڕێی ئەمەی دەکرد ؟ تەنها چەند برادەرێکی خۆی بەم هەواڵە نیگەران دەبن بەڵام ئەوانیتر ئاخ لەدەست ئەوانی تر ...

ئەندامی کۆڕی زانایان / ( بە جلو بەرگی ڕەسمیەوە خۆی بە ژووردا شمشێرەکـەی لـــە لای ڕاستی بەستوە .. لەسەر سنگیەوە تا ناو قەدی بە نیشانەو خـەڵاتی هەمـــەجـــۆر داپۆشراوە ) ئەوە چۆنە وا زوو لەخـــەو هەستاویت ؟ ( بە هاوڕێکەی ) ئەی تـــۆ چۆنە وازوو هاتوویت ؟ چیـــە ؟ چـــی ڕوویداوە ؟ ئەنجامەکەت هێناوە ؟ .

ژن / ئای کە شورەییە .

هاورێ / ( بە ژنی ئەندامی کۆڕ ) زیاتر دڵتەنگی مەکە هاوڕێی خۆشەویستم ( بە ئەندامی کۆڕ ) لە تاقیکردنەوەکاندا دەرنەچووین .

ئەندامیکۆڕ / بەڕاستە ؟ ! !

هاورێ / نەدەبوو بەشداری تاقیکردنەوەکانـــی دوا ناوەندی گشتی بکەیت

ئەندامی کۆڕ / یانی لە تاقیکردنەوەکانی دوا ناوەندی گشتیدا دەرنەچـــوم ئـــەو خوێریانـــە ئەوەیانلەگەڵ کردم ؟

هاوڕێ / دوێنێ ئێوارەیەکی درەنگ ئەنجامەکانیان بڵاوکردەوە .

ئەندامی کۆڕ / کەدنیا تاریک بوو بێن کاتێک کە هەڵیانواسیوە ناخوێنرێتەوە تۆ چۆن بۆت خوێنرایەوە ؟

هاوڕێ / گڵۆپی لێبوو .

ئەندامی کۆڕ / هەر دەیانەوێت بم شکێنن .

هاوڕێ / ئەم بەیانیەش بەوێدا تێپەڕیم لیستەکان هەر هەڵواسرابوون .

ئەندامی کۆڕ / دەبوو شتێ پارەت بکردایەتە دەستی دەرگاوانەکەوە تالیستەکانی لێبکردایەتەوە .

هاوڕێ / کردم .. بەڵامبەداخەوە پۆلیسی لێبوو .. ناوی تۆش لە لیستەی دەرنەچووەکاندا یەکەم ناوە .. خەڵک پالەپەستۆیەتی بۆسەیرکردنی ئەنجامەکان .

ئەندامی کۆڕ / کێ ؟ کەس‌وکاری قوتابیەکان ؟

هاوڕێ / نەك هەر ئەوان .

ژن / بێگومان ئێستا هەموو دۆست‌و دوژمنەکانیش لەوێن ، هەموو ئەوانەی‌کە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان هێرشت دەبردە سەریان کەگوایەهیچ‌نازانن . قوتابیە کۆنەکانێ . هەموو ئەوانەی کە دەیانویست پلەی مامۆستایی وەرگرن‌و تۆ بڕیارت لەسەر نەدەدا ئەو کاتەی کە سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردنە کەبووێ .

ئەندامی کۆڕ / ئای کە شورەییە .. بەڵام هەرگیز خۆبەدەستەوە نادەم بێگومان ئەم ئەنجامانە هەڵەیەکی هەر لیایە .

هاوڕێ / قسەم لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە لەگەڵ تۆدا بەشداریی تاقیکردنەوەکانیان کردبوو . ئەنجامی دەرسەکانی تۆیان دامێ لە ماتماتیکدا سفرت وەرگتووە .

ئەندامی کۆڕ / بێ .. چونکە من لە دەرسە زانستیەکاندا توانایەکی ئەوتۆم نیە .

هاوڕێ / لە زمانی ئینگریقیشدا سفرت وەرگرتووە هەروەها لە زمانی لاتینیشدا هەر سفرت وەرگرتووە .

ژن / تۆ لە لێکۆڵینەوە مرۆڤ ناسیەکاندا پسپۆڕیت‌و بەرگری لە مرۆڤایەتی دەکەیت هەروەها خاوەنی کتێبی ( بەرگری لە کارە مرۆڤ پەروەریەکان‌و بەرزکردنەوەیان ) یت .

ئەندامی کۆڕ / نا .. لەو کتێبەدا باسی مرۆڤایەتیە نوێیەکان دەکەم ( بەهاوڕێکەی ) ئەی لە زمانی فەرەنسیدا لە داڕشتن‌دا چەندم وەرگرتووە .

هاوڕێ / نۆسەدت وەرگرتووە .

ئەندامی کۆڕ / ئێ .. ئەوە پلەیەکی هێجگار بەرزە هەقی ئەوانی تریشی کردۆتەوە .

هاوڕێ / نەخێر بەداخەوە .. بەرزترین پلەی دەرچون دووهەزارە . هێشتا دەبێ سەد پلەی ترت بۆدابنێن تادەرچیت .

ئەندامی کۆڕ / هەبێت‌و نەبێت غەدریان لێ کردووم . ڕەنگە دەفتەرەکەیان گۆڕیبم .

ژن / تۆ هەمیشە وا تێدەگەیت کە غەدرت لێ دەکرێت .. نەخێر هەرگیز بڕوا ناکەم دەفتەرەکەیان گۆڕیبێت .

ئەندامی کۆڕ / بەڵێ گۆڕیویانەو ئەم کارەش یاسا ڕێگای پێ نادات‌و من خۆم سەرۆکی لیژنەی تاقیکردنەوەکانی دوا ناوەندیم لە وەزارەتی پەروەردەی نەتەوایەتی‌و لە سبەینێ زووتر نیە کێشیان دەکەمە بەردەمی دادگا .

ژن / گیانەکەم .. بۆ خۆشت نازانی دەڵێیت چی : وڕێنەدەکەیت .. ئەی بیرت نیە پێش ئەوەی بەشداریی تاقیکردنەوە بکەیت ئیستقالەت کرد تا خەڵك گومانت لێ نەکات .

ئەندامی کۆڕ / لە ئیستقالەکەم پاشگەزدەبمەوە .

ژن / وام لێ دەکەیت بڵێم دەرنەچوونەکەت زۆر ئاساییە .. کەتۆ خاوەنی ئەم ئەقڵە منداڵانەیە بویت .. چونکە ئەو تاقی کردنەوانە پێویستیان بە مێشکێکی پێگەیشت‌و تێگەیشتن هەیە .

ئەندامی کۆڕ / سەیر ئەوەیە لەگەڵ دووسەد کەسی تردا بەشداری تاقیکردنەوەم کرد کە هەموویان بە منداڵم دەشیان .

ژن / نەدەبوو بەشداری بکەیت .. چەند جارم پێ وولیت بەشداری مەکە... بەڵام هیچ .. خۆ تۆ قسەی کەس ناچێت بە مێشکتدا .. هەر حەز لە خۆ زل‌کردن دەکەیت‌و بە هیچ دانامرکێیت قەت بە شتێك ڕازی نابیت .. پێم نالێی چ پێویستێکت بەم هەموو بڕوانامەیە هەیە .. تازە ئیتر هەموو شتێکت لە دەست دا .. تۆ دکتۆرات هەیە لیسانست هەیە بڕوانامەی فێر بوونی

سەرەتایت هەیە ، بڕوانامەی تەواو کردنی خوێندنی سەرەتاییت هەیە ، لە تاقیکردنەوەی بەشی یەکەمی بەکالۆری دا دەرچوویت . ئەمەت بۆچی بوو ؟

ئەندامی کۆڕ / ئاخر ئافرەت بۆشاییەك لە بڕوانامەکانمدا هەبوو .

ژن / کێ بیری لەوە دەکردەوە ؟

ئەندامی کۆڕ / ئەزانم .. بەڵام کاتێ کە چووم بۆ بەڕێوەبەرایەتی کۆلێجەکەی تەواوم کردبوو ،

داوای نوسخەیەکی بڕوانامەی لیسانسەکەم کرد بەڕێوەبەر ووتی : بەسەرچاو گەورەم ئەندامی کۆڕی زانایان .. هەر ئێستا سەرۆکی بەڕێز .. بە چاوان قوربان . دوای ئەوە گەڕابۆوەم بدۆزێتەوە ، پاش تۆزێك گەڕایەوە بە شلەژاوی و شەرمەزاریەکی زۆرەوە ووتی : سەیرە .. شتێکی زۆر سەیرە بەڕێزتان بڕوانامەی لیسانستان وەرگرتووە بەڵام ئەم بڕوانامەیەتان بێ کەلکە . . منیش ووتم بۆچی هۆی چییە ؟ ووتی : بۆشاییەك لە پێش ئەم لیسانسەوە هەیە نازانم ئەمە چۆن ڕوویداوە . بەڕێزتان لە کۆلێجی ئاداب وەرگیراون بەبێ ئەوەی بەشداری بەشی دوەمی بەکالۆریای دواناوەندی بکەن .

هاوڕێ / نێ .. ئینجا ئەوە قەیدی چییە ؟

ژن / یانی ئیتر بڕوانامەی لیسانسەکەت نادەنێ ؟

ئەندامی کۆڕ / نا .. دەیدەن .. بەڵام جارێ ڕایان گرتووە پێیان ووتم : هەر کە بەشداری تاقیکردنەوەکانت کردو بەکالوریت وەرگرت ئەو کاتە ئێمەش نوسخەیەك لەلیسانسەکەت دەدەینێ . بەشداری تاقیکردنەوەکانی دواناوەندی بکە بێگومان دەردەچیت ئیتر منیش ناچاربووم بەشداری بکەم

ژن / هیچکار بەو جۆرەش ناچار نەبوویت .. پێم نالێی بۆچی ئەوەندە بە دوای ئەو پێویستی بەو جۆرە بڕوانامانە چییە ؟ دوای ئەوە تۆ کەس داوای شتی وای لێنەکردبویت

ئەندامی کۆڕ / لە ڕاستیدا هەر پێیان ووتم تۆ بەکالۆریت نیە ووتم شتی وا نیەو نابێت نەشمدەزانی بەڕاستی ئایا بەشداری تاقیکردنەوەکانم کردوە یان نا .. ماوەیەکی زۆر بیرم کردەوە کاتێکی زۆر خۆم بە بیرکردنەوەوە خەریك کرد تا بیرم هاتەوە کە ڕاستەدەکەن و بەشداریم نەکردوە چونکەئەو ماوەیە هەڵامەتم بوو .

ژن / ئەی بۆ نالێی سەرخۆش بووم وەك هەموو جارەکانی تر ؟

هاوڕێ / هاوڕێی خۆشەویستم مێردەکەت مرۆڤێکی دڵ پاك و بە ویژدانەو خاوەن هەستێکی زیندووە بۆشاییەك هەیەو دەیەوێ پڕی بکاتەوە .

ژن / وانیە تۆ وەکو منی ناناسیت .. ئەم دەیەوێ بەرزتر بفڕێت بەم هەموو بڕوانامەیە تێر ناخوات دەیەوێ ئەو لیسانسەش لەناو ئەوانی تردا هەڵواسێت .. نازانم بڕوانامە نرخی چییە ؟ زۆربێت یان کەم کێ ئاوڕی لێ دەداتەوە ؟ مەگەر هەر خۆی سەیریان بکات ، چەند جار ئاگام لێبووە شەوان لەناو نوێنەکانی هەستاوەو لەسەر نووکی پەنجە بەبێ دەنگی لە ژووری نووستنەوە هاتووە بۆ ژووری میوان و سەیری بڕوانامەکانی کردووەو ژماردوونی .

ئەندامی کۆڕ / نێ .. پێم نالێی مرۆڤ کە خەوی لێ نەکەوت چی بکات ؟

هاوڕێ / خۆی هەمیشە پرسیارەکانی بەکالۆری لە پێشتردا دەزانرێت چییە ؟ بەتایبەتی ئەو پایەو شوێنەی تۆ هەت بوو دەبوو بە ئاسانی پێشتر بت زانیایە پرسیارەکان چین ؟ یان دەبوو یەکێکی ترت لە جیاتی خۆت بناردایە وەڵام بداتەوە ، قوتابیەکت بناردایە . یان کە هەر سوور بوویت لەسەر ئەوەی خۆت وەڵام بدەیتەوە کارەکەرەکەت بناردایە پرسیارەکانی بکڕیایە خۆ پرسیارکان لە بازاڕی ڕەشدا بە ئاسانی دەست دەکەوێت .

ئەنوامی کۆڕ / نازانم چۆن لە زمانی فەرەنسیدا دەرناچم .. سێ پەڕەی تەواوم پڕ کردۆتەوە بە دوورو درێژی لەسەر باسەکەم نووسیوە لەسەر پەیوەندی مێژوویی باسەکە دواوم .. بە شێوەیەکی باش شیەلم کردۆتەوە نەدەبوو ئەم نمرە کەمە وەربگرم .

هاوڕێ / بیرت دێ باسەکە چیبوو ؟

ئەندامی کوڕ / ئۆ .. ئۆ ...
هاوڕێ / نازانێ هەر باسی چیشی دەکرد .
ئەندامی کوڕ / نا .. ئۆ .. ئۆ ...
هاوڕێ / باسەکە کار تێکردنی هونەرمەندەکانی چاخی ڕاپەڕین لەسەر ڕۆماننووسە فەرەنسایەکانی سەردەمی کۆماری سێهەم بوو نوسخەیەکی وەلامەکەی تۆشم لە لایە ها بیخوێنەرەوە بزانە چیت نووسیوە .
ئەندامی کوڕ / ( پەڕەکە وەردەگرێت و دەیخوێنێتەوە ) مەسەلەی بنیامین دوای ئەوەی کە بنیامین درا بە دادگاو بریاری بەردانی درا باریدەدەرەکانی قازی لە سەرۆك ڕاپەڕین و پەلاماریان داو کوشتبان دوایش بریاریاندا لە گشت مافەکانی بێبەریبکەن و نۆسەد فەرەنك جەزای لێبسێنرێ .. تۆش نۆسەد نمرەت وەرگرت .
ئەندامی کوڕ / (لەسەر خوێندنەوە بەردەوامە) پاشان بنیامین دەستی بە فەرمان ڕەوایی کردەوە.. ئەوەی تریم بۆ ناخۆێنرێتەوە .. دەسخەتم هەروا ناخۆشە .. دەبوایە چاپم بکردایە
ژن / سەیر دەبێت بە تەما بوو بیت ئەم خەتە ناخۆشەو ئەم هەموو ڕەش کردنەوانەو ئەم هەموو پەڵە مەرەکەبەی سەر پەڕەکەت نمرەکانت بەرزبکاتەوە .
ئەندامی کوڕ / ( پەڕەکە لە دەستی ژنەکەی دەستێنێتەوەو بەردەوام دەبێت لەسەر خوێندنەوە .. ) بنیامین دەستی بە فەرمان ڕەوایی کردەوە پاشان پۆلیس ئابلوقەیدا دنیا تاریکە ووشەکانی تر نابینم چاویلکەکەشم پێنیە .. بەڵام ئەمەی نووسیومە فری بە مەسەلەکەوە نیە .
هاوڕێ / ڕاست دەکەیت ئەوەی کە نووسیوتە هیچ بەلای باسەکەدا ناچێت .
ئەندامی کوڕ / نا باسم کردووە بەڵام بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نا .
هاوڕێ/ تەنانەت بەناڕاستەوخۆش بەلایدا نەچوویت.
ئەندامی کوڕ / ڕەنگە لە بارەی باسەکەی ترەوە دوابم.
هاوڕێ / بە تەنیا یەك باس هاتبووەوە .
ئەندامی کوڕ / با هەر یەك باسیش هاتبێتەوە خۆ من باسی شتێکم هەر کردووەو بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لێی دواوم و کەرەگ و ڕیشەی مێژووم تەی کردووەو نرخی هەموو شتێکم دەرخستووەو هەڵس و کەوت و خوو ڕەوشتی کەسەکانم ڕوون کردووەتەوە . پەردەم لەسەر ڕاستی ئەو خوو ڕەوشتانە هەڵداوەتەوەو کۆتاییە کەشیم نووسیوە ، ئەوانی ترم بۆ ناخوێنرێتەوە ( بەهاوڕێکەی ) دەتوانیت بیخوێنیتەوە ؟
هاوڕێ / ( سەیری نوسینەکە دەکات ) بۆم ناخوێنرێتەوە ، منیش چاویلکەکەم هەڵنەگرتووە .
ژن / ( پەڕەکە وەردەگرێت ) خوێندنەوەی زۆر گرانە .. هەر چەندە من چاویشم تیژە بۆم ناخوێنرێتەوە .. بەڵام ئەمە نووسین نیە ، هەروا ویستووتە وای نیشان بدەیت کە شتێکت نووسیوە ، ئەمە شەڕە پشیلەیە ،
ئەندامی کوڕ / وانیە .. وانیە ئەوەتا کۆتاییەکەشیم نووسیوە ئەوەتا بەگەورەیی نووسیومە ( کۆتایی‌یان سزا ) نابەڵم ئەم کارە هەروا بە ئاسانی بڕوات هەوڵ دەدەم ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوانە هەڵوەشێنمەوە .
ژن / باسەکەت بە شێوەیەکی ڕێك و ڕەوان نە نووسیوە هەروا هەڕەمەکی داوتە بەسەر یەکداو لە چەند ناوونیشانێك زیاتر هیچی ترت نەنووسیوە کە واتە زۆر بەداخەوە دەڵێم ئەو نمرەیە هەقی خۆتە کە بۆیان داناویت .
هاوڕێ / مۆڵەتێك وەرگرەو پشوویەك بدە باشترە چونکە هیچت بۆ ناکرێت .
ژن / ئەو مامۆستایانە خۆیان دەزانن چی دەکەن .. هەروا لە خۆڕایی نەکراون بە مامۆستا .. ئەوانە لە چەندەها تاقیکردنەوەدا دەرچوون و توانایەکی زۆر چاکیان لە داڕشتندا هەیە .
ئەندامیکوڕ / دەستەی تەحکیم کێ و کێ بوون ؟
هاوڕێ / بۆ ماتماتیك مەدام بینوم دانرابوو بۆ زمانی ئیغریقی مامۆستا کاکۆس و زمانی لاتینیش مامۆستا نیرۆن دانرابوون .
ئەندامی کوڕ / ئەمانە هیچیان لە زانستدا ناگەنە من ، ئەی بۆ زمانی فەرەنسی ؟
هاوڕێ / ئافرەتێکە سکرتێری نووسینی گۆڤاری ( دوێنێ و پێرێ و ئەمڕۆ ) یە .

ئەندامی کۆڕ / نا .. ئێستا تێگەیشتم .. چاکی دەناسم ئەو ئەگریسە ئەوە بۆیە ئەو نمرە خراپەی بۆ داناوم تا تۆڵەم لێ بکاتەوە ، ئەوە بۆیە ئەوەی کردووە چونکە پێی وتم ناوی خۆم لە پارتەکەیدا بنووسم ئەم نووسی لە داخدا وای کردووە ، بەڵام من دەتوانم ئەم تاقیکردنەوانە هەموویان هەڵوەشێنمەوە هەر ئێستا تەلەفۆن بۆ سەرۆکی دەوڵەت دەکەم .

ژن / نەکەی .. شتی وا نەکەیت با لەمە زیاتر گاڵتەت پێنەکەن ( بە هاوڕێ ) مەهێڵە تۆ لە من زیاتر دەسەڵاتت بەسەریدا هەیە .

هاوڕێ / تەلەفۆنی بۆ مەکە .

ئەندامی کۆڕ / خۆم دەزانم چی دەکەم ( لە تەلەفۆنەکەدا ) هەلاو .. سەرۆکایەتیە .. سەرۆکایەتیە .. بەیانیت باش خوشکێ دەمەوێ لەگەڵ سەرۆکدا قسە بکەم .. بەڵێ .. نا .. بەڵێ لەگەڵ خۆیدا .. کارێکی تایبەتیم پێیەتی پەیوەندی بە هەردوکمانەوە هەیە .. هەلاو .. چۆل .. منم .. منم .. کۆ گوێبگرە .. هەلاو .. هەلاو ..

ژن / خۆیەتی ؟

ئەندامی کۆڕ / ( بە ژنەکەی ) بێ دەنگ بە ( لە تەلەفۆنەکەدا ) نا .. هاوڕێی خۆشەویستم گاڵتە دەکەیت .. وانیە .. وانیە سوعبەت دەکەیت .. ها . ( تە لەفۆنەکە دا دەخات ).

هاوڕێ / ووتی چی ؟

ئەندامی کۆڕ / ووتی .. نامەوێ قسەت لەگەڵ بکەم دایکم ناهێڵێ لەگەڵ تەمەڵەکانی پۆلدا قسە بکەم .. و تەلەفۆنە کەی داخست .

ژن / دەبوایە زوو ئەوەت بزانیایە .. چیت کرد ؟ هیچت نەهێشت هەموو شتێکت لەناوبرد .

ئەندامی کۆڕ / قەیدی چییە ؟ خۆ من چەند جار لە زانکۆی سۆربۆن موحازەرەم ووتووەتەوە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ، لە زانکۆکانی تری ئەمەریکا. تا ئێستا هەر لەسەر نووسینەکانم زیاد لە دەهەزار بەڵگە نامەوەرگیراوە .
سەدان لێکۆڵەرەوە خەریکی شیتەڵ کردنەوەی نووسینەکانمن .
زانکۆی ئەمستەردام ، کۆلێجە نهێنیەکانی

لۆکسمبۆرگ پڕوانامەی دکتۆرای فەخریان پێ بەخشیوم .
سێ جار خەڵاتی نۆبلم وەرگرتووە .
پاشای سوێد نۆر سەری لە بلیمەتیم سوڕما .
دکتۆرای فەخری .. دکتۆرای فەخریم هەبێتو لە بەکالۆریدا دەرنەچم .

ژن / هەرچی کەس هەیە گاڵتەمان پێدەکات .

( ئەندامی کۆڕی زانایان شمشێرەکەی بە ئەژنۆی دەکات بە دوو کەرتەوە . هاوڕێکەی دادەنەوێتەوە دوو پارچەی شمشێرەکە هەڵدەگرێتەوە . )

هاوڕێ / ئەمانە بەڕێزەوە هەڵدەگرم تا ببنە یادگاری زەمانی مەزنیەکەمان .

( ئەندامی کۆڕ بە تووڕەییو هەڵەشەیەوە دەست دەکات بە لێکردنەوەی نیشانەو خەڵاتەکانی بەرۆکیو بە لەقەوە دەچێتە سەریان . )

ژن / ( دەیەوێت مێردەکەی ڕابوەستێنێت .. دادەنەوێتەوە چی بەردەست بکەوێت هەڵیدەگرێتەوە . ) مەکە .. نەکەی .. نەکەی لەمانە زیاترمان بۆ نەماوەتەوە .

« پەردە »

نەهێشتنی نەخوێندەواری
لابردنی زۆرداری یە لە کۆمەڵایەتی

# شانۆگەری - خەج و سیامەند - و چەند سەرنجێك

احمد محمد ئابلاخی

**« هەرکەسێ هاتو وتی من عاشقم بڕوامەکە ..**
**تا لەسەر گۆنای نیشانەی زەخمی مارانگاز نەبێ »**

ئەم دودێرە هۆنراوەیە سەرەتایەك بوو بۆ دەست پێ‌کردنی شانۆگەری « خەج‌و سیامەند » ئەم بەرهەمە یەکێکە لە کەلەپورە بەنرخەکانی گەلەکەمان ..کە بۆمان جێ‌ماوەو بە لاتین نوسراوەتەوەو مامۆستا « فۆاد مەجید میسری « حسن فۆاد » توانیویە بیکۆڕێتە شێوەیەك کەلەگەڵ واقعی ئەمڕۆماندا بگونجێت .

ژیاندنەوەی ئەم کەلەپورە بەو شێوە گونجاوە نوێ‌یە هەڵبەت شارەزا بوون‌و ماندوبونی دەوێ چونکە توانیویەتی ڕەسەنی بەرهەمەکە وەك خۆی بهێڵێتەوە شاعیرێك دەڵێ :

**« ئەما خانی کە چیرۆکی عەشقی ئێمە دارێژێ**
**.... دەنا ئێستەش لە کوردستان دەژین زین‌و مەمێکی تر » (٢)**

هەڵبەت ئەوەی کە تۆزێ ورد بڕوانێ‌و گەش ببین بێ دەزانێ شاعیر کام زین‌و مەم دەڵێ‌و کام عەشقی دەوێ دابڕێژرێ ، هەرواش لەو بەرهەمەدا مامۆستا « فواد » پێی وتوین کە کام خەج ئەڵێ : خەجێك کە مافێکی ئاسایی هەموو مرۆڤێکە ... سیامەندیش بەو عاشقە دائەنێ کە تاکوو وا بیر بکاتەوە هەرگیز نابێ بە خاوەنی خەج « بەمانا فراوانەکەی » .

خەج ئەو شۆخە دڵ پاکەیە کە سیامەند عاشقیەتی ، شان بەشانی سیامەند سێ داوکاری تری خەج هەیە ... هەر یەکەش لەوان خەج بە هی خۆی ئەزانێ هەوڵی بۆ ئەدات ، تا ئێرە مامۆستا فۆاد پێمان دەڵێ کەچۆن خەج هەندێ هەوڵی بۆ ئەدەن‌و هەرگیز هیچ کامیان ڕەوانی‌یە بنە خاوەنی خەج یەکێك لەداوکاران « مەمەند »ی جەوهەردارە کە بە سامانەکەی دەنازێت ، بە مەنتیقی گیرفان بیر دەکاتەوە ، مەمەند نموونەی بۆرژوایەکی ساویلکەیە داواکارێکی تری خەج میرزا « عەباس »ی ئەو قاتە ئەمیش بە پشتی خوێنەواریەکەی دەنازێ‌و خۆی لە هەموو کەس بەزاناتر دەزانێ ئەمیش نمونەی ڕۆشنبیرە بورژوا بچوکەکانە . داوا کاری سێ‌هەم سەرۆك عەشیرەتی « دەزۆزانی‌یە » کە بەدووشت دەنازێ یەکەم: بە عەشرەت‌و ناوو شوهرەتی دیوەخانی، دووەم : بەسامان‌و موڵك داری .. بەم دووشتە دەیەوێ خەج لە ئامێز بگرێ .. ئەمیش نموونەی دەرەبەگێکی خانەوادەیە .

ئینجا بابزانین نووسەر تاچ ڕادەیەك توانیویەتی بەپێی سایکۆلۆژیەتی چینایەتی پەیوەندیان‌و هەوڵدانیان دیاری بکات .

کە هێزی دەرەبەگ بەخۆی‌و سامان‌و عەشرەتەوە هاتە پێشێ‌و داوای خەجی کرد مەمەندی



جەوهەردار دەستی بە مەرایی کردو لە ئەنجامدا هەر خۆشی دەستی باوکی خەجی ماچ کرد،کە خەج بدەن بە سەرۆك عەشرەتی دەزۆزانی ، بەلام میرزا عەباس ئەوقاتی هێزی دژایەتی زیاتر لەمەمەند تێدایە هەتا ئەو کاتەش کە سەرۆك عەشرەت لەدەیبا بۆ خوازبێنی خەج هەر هیوای بە خەج هەیە ! بەلام دەڵێ : دێم بۆ داخوازی خەج بۆتۆ ، بەلام لەوێ خەج بەکاممان ڕازی بوو ئەوا خوازبێنی بۆ ئەومان دەکەین .. سەرۆك عەشرەت لە زمانی لووس‌و زانستی خوێندەوار دەترسێ بۆیە گفتی ئەوە نادات‌و ئەڵێ من بەوە قایل نیم‌و خەج هی خۆمە .. لەهەمان کاتدا هەریەکەلایەنی خراپی ئەوی تر بۆ جەماوەر باس‌دەکات ... ، مەمەندی ترسنۆك هەر زوو ئەکشێتەوە ، بەلام لەم زەم‌و زەم کاربەدا سەرۆك عەشرەت بەمیرزا دەڵێ : کەتۆ ڕاس دەکەی‌و هێندە عاشقی خەجی ئەی بۆ ئەو ساڵە لە گەرمەسێرڕا خوازبینی‌کەرت هێنا بۆ خەج‌و خۆشت خوازبێین بۆنەکردن ، ئەویش تەبریری ئەوەیە کە کەمێ ڕووگیر بووەو هەموو کاتێ عەقلێش میوانی مروڤ‌نی‌یە! ئینجا میرزا بەو دەڵێ کە خوێنەوار نی‌یەو خەج لایەنی خوێنەوارو جەنابیشت جارێکی تر خوازبێنی کەرت بۆ خەج هێنا ، ئەمانە هەموو شتی گرنگی‌و هەمومان ئاگاداری ئەو خوازبێنی کەرانەین کە هەردوولا لە بێگانە هێناویانەو نەخوێنەواری سەرەك عەشرەتیش ئاشکرایە خۆ ئەگەر مەمەند بیوێرایە ئەوا ئەویش تەکانی خوازبێنی کردنی بۆ لایەکی تر ئەدا بەلام سەرۆك عەشرەت زوو چاو ترسینی کردو تەك خۆی خستی ، لەئە نجامدا خەج بە پێویستی میری درا بە سەرۆك عەشرەت‌و دیوەخان .

هەر لەم چەن‌و چۆنەدا جەماوەر هەر سێ لایەنی بۆ ڕوون ئەبێتەوەو خەج بەڕەوای ئەو نابینن ــ بۆیە خەجیش بەو ڕازی نابێت‌و ئامێزی سەرەك عەشرەت گەرم ناکاتەوە .

لێرەدا تەنها سیامەند ماوەو جەماوەر چاوەڕوانی ئەوە ئەکات ببێتە خاوەنی خەج بەلام سیامەندە هەرزەو سەرچڵ هاوڕێ‌یەکی ئاسنگەری کە تەمێ‌ی ئەکات‌و پێ‌ی ئەڵێ عاشقی ڕاستەقینە ئەبێ چۆن بێت ، پینەچی لەبە یوەندی خۆی‌و شاگردەکەیدا نیشانی ئەدات کە تەمێ کردنی سیامەند سودی نی‌یە ! چۆن ئەو بەشاگردەکەی بڵێ برۆ یان مەڕۆ ئەو هەر ئەڕوات ، ئەویش لە هەمان قالێدایە .. چونکە سیامەند پاش قسەکانی ئاسنگەر ، بە هەموو هۆشمەندیەکیەوە ئەڵێ : بانەوان خەج بەمن ڕەوا نەبینن‌من هەر گاز ئەکەم ، هەر هی منە ، هەر هی‌منە .. ئاسنگەریش بەدەم حەیران گووتنەوە ، بە سیامەند ڕانەگەێنێ کە ئەوەی دەیەوێ ببێ بە خاوەنی خەج ، دەبێ زروفی مەوزوعی‌و زاتی تەواوو گونجاو بێت‌و زەمینەیەکی ڕۆشنبیری کاملی هەبێ .. ، بەلام سیامەند ڕێگەی ڕاستی نەدۆزیەوە ، تەنیا پشتی بە خۆی بەستبوو .. بۆیە خەج پێ‌ی ووت : دنیا ئەنگوستە چاوە بانەڕۆێن ! ، بەلام سیامەند هەر لەسەر ڕای چەوتی خۆی سوور ئەبێ وپەلە پەل دەکات .. خەج ئەمجارەی پێ‌ی دەڵێت وادیارە هیچ ئاگات لە دنیا نی‌یەو سەری دنیا بە پووش گیراوە ، هەموو بەلگەی سیامەند ئەوەبوو ئەی ووت : کەسێ عاشقی تۆ بێت گوێ ناداتە ئەوانە ... ، حیکایەت خوان ڕوون تر باسەکەی باس دەکات‌و دەڵێ : عەشقی خەج مۆمێکە لەدڵی سیامەندا ئەسوتێ ، تەنها دڵی روناك کردۆتەوە بەلام بستێ بەربەی خۆی نابینێ ــ ، ئەمە هۆی ئەوەیە سیامەند بکەوێ ، بەرەو هەڵدێر بخلیسکێ .. ، ئەمە ڕەنگە بینەران وا تێ‌بگەن کە هەڵدێرانی سیامەند ڕیکەوتێ بووە ئەگەر ڕێکەوت نەبوایە بە ئاوات ئەگەیشت .. ، بەلام ڕاستەکی ئەم تێ‌کەوتنەی سیامەند پێویست بوو . ئەمە ئەو بەرکە نوێ‌یە بوو کە مامۆستا فۆاد کردیە بەرگی ئەو کەلەپورە بەنرخەوەو زیانیەوە .

کۆتایی شانۆگەریەکەش بە هۆنراوەیەك دوایی هات کە دوو دێری کۆتایی دەڵێ : « خەج دولبەرێکی شەیدایە » چاوە روانی سیامە ندێکی وریایە .

بەلام بە گشتی گرنگترین شتی لە شانۆگەریەکەدا کە نیشانەی گەش بینیە ئەوەیە کە خەج هەڵ نەدێراوە ، ئەگەر ئەو سیامەندە بەو ریایانە بێتە کایەوە لە ئامێزی دەگرێ .

لە کۆتایی‌دا ئەڵێم کە ئەمە یەکەم شانۆگەری کوردی‌یە کەرەسەکەی لە ڕوداوێکی واقیعی‌یەوە هەڵهێنجرابێت .. پیش‌کەش کردنیش وەك حیکایەت خوانەکانی چاپخانە کۆنەکانی کوردستان پێك هێنرا بوو .

**دەرهێنان :**

قوتابخانەی بریختی ، ڕێبازێکی ناسراوەو چوارچێوەیەکی تایبەتی هەیە لە پێش‌کەش کردنا هەرچەندە ئەم جۆرە دەرهێنانە تائێستە بە شێوەیەکی دروستی خۆی لە شانۆگەری کوردیدا نەبینیوە ،

ئەگەریش شانۆگەریەکیشمان دابێتە پاڵ دەرهێنانێکی بڕێختی ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بووبێ کە تەنیا حیکایەت خوانی تیا بووەو بەس ، ئەگینا هیـــچ سیمایەکـــی بریختی بەخۆوە نەدیوە نموونەش بۆ ئەمە شانۆگەری « مۆلەتو ئابلۆقە » یە .

مەبەستی سەرەکی لە شانۆگەری بریختی ئەوەیە کەدیواری چوارەم نەمێنێ ، بەمانا جەماوەر وا هەست نەکەن کە کۆمەڵێك هاتوون بە خۆ ئامادەکردنێکـــی تەواوەوە ، حیوارەکانیان لەبەر کردووە ، هەروەهـــا ئەکتەریش واهەست بکا کەکەس گوێ لێنەگرتووەو تەنها ڕوداوێك بۆخۆیان دەگێڕنەوەو گوێ نەدەنـــە جەماوەر ، بەڵکوو تێکەڵ بوون بە جەماەرو پەیوەندیو قسەکردن لەگەڵیاندا جۆری حوار دیاری بکاتو گوێ بلەرێتە بیروڕاکانیان . هەروەها ئەکتەر نەبەسترێتەوە بەنەخشیەکی ئەندازیاری جوڵانەوە .

ئەم شانۆگەریە تاڕادەیەکی زۆر شێوەی بڕێختی بەخۆیەوە هەڵگرتووە جەماوە کە دەچێتە ژوورەوە وا هەست دەکات بۆ چایخانەیەکی کۆن دەچێ ،من وەکو ئەو چایخانانەم نەدیوە بەڵام باسیان بۆ کردووم کە هەموو شەوێك خەڵکی شار لێ کۆبونەتەوەو چەند کەسێکی قسەخۆشی و نووکتەبازو چیرۆك زان ، لە داستانە کۆنەکان .. دواونو خەڵکی تا درەنگ گوێیـــان لێگرتووە .. ، هەرچەندە ئەو ســەردەمە ئـــەوان بریختیان نە ناسیوە ئەشێ بڕێختیش ئاگاداری ئەمان نەبوبێ .. ، ئەشێ کارەکەی ئەوان لەســـەر شێوەی بریختی بووە یان بریخت سوودی لەو شێوە حیکایەت خوانیە وەرگرتووە .

بە سەر چایخانەکەوە نوسینێ هـــەڵواسراوە « قاوەخانەی وەستا شەریف » لەژوورەوە لبـادی کوردی داخراوە لەبەر دەم ژورەکەدا کورسیەك بـۆ حیکایەت خوان دانراوە ... ، تابلۆیەك هەڵواسراوە ، لێی نوسراوە « الحسود لا یسود » دەورو پشتی بە وێنەی زولفە قارو بوراق ڕازاوەتەوە ، پێش ئەوەی حیکایەت خوان بێتە ژوورەوە خەڵکی دانشـــتوونو چاوەڕوانی دەکەن .. ئەو دەڵێ بۆ نەهات .. یەکێکی تر دەڵێ بەخوا ئەمشەو دواکەوت .. وا لە بینەران دەکات کە ئەوانیش وەك ئەوان چاوەڕوان بن . پاشان دێتەو دادەنیشێو دەڵێ : « ئەمشەو باسێکی ئیجکار خۆشتان بۆ ئەگێڕمەوە » پاش ئەوەی کەهەندێــك لەباسەکە ئەگێڕێتەوە وا سیامەند نیشان دەدات کــە خەجی بۆ نابێ .. لەبڕ یەکێك هەڵ ئەسێو دەڵــێ : « قەت ناشێ سەری ئەمیش وەکوو فەرهاد و ... بدەی بەفەتارەت » ئەویش دەڵێ ئەگەر بەم بەیتانەی من ڕازی نابن خۆتان شتێ باس بکەن لەمە باشتربێ . جارجارەش ڕائـــەوەستێو ڕوی پرسیار ئەکاتـــە خەلکەکە بەگشتی .

یاخود دەستی بۆ جەمـــاوەر ڕائەکێشێو لێیـــان دەپرسێ : کەئابا خەج بۆ کێ دەبێ ... ، یەکێ دەڵی بۆ مەمەند ، یەکێ دەڵێ بۆ سیامەند .. ئەبێ بـــە مشتو مر لەنێوانیاندا ، کرێکارێك کە نموونـــەی مرۆڤێکی تێگەیشتووە ، هەڵئەستێتە سەرپێو دەڵێ بۆ هیچیان نابێ .

پاش ئەوەی سیامەند هەڵ ئەدێرێو خـــەج لەسەر کێوی کێلە سپیان ئەمێنێتەوە ، حیکایـــەت خوان ڕوونەکاتەوە بینەرانو لێیان ئەپرسێ : ئێوە ئەتانەوێ خەج هەڵدیرێ ، هەندێکی خەڵکی ئەڵێن : باش سیامەند ژیانی بۆچی‌یە هەندێك ئەڵێن نەء .. نا .. نەء .. ، حیکایەن خوان ئەڵێ « ئەگەر ئەتانەوێ سیامەند هەڵنەدێری با هەموومان عاشق بین » ئەمانە هەمووی نیشانەی ڕووخانی دیواری چوارەمەن .

شتێکی تر کە سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کــە حیکایەت خوان جارجارە باسەکەی بە قسەی خۆشی یان بە حەیرانەوە ئەبگێڕایەوە یاخود جار ناجـــارە ڕوخسەتی پشوو دانی وەرئەگرت ، تا تۆزێـــك بحەسێتەوە ، جار جارەش سینی‌ی چا ئەهاتو دەست بە چا خواردن ئەکرا ـ ، ئەتوانم بڵێم کە لە شانۆگەری « مۆلەتو ئابلوقە »دا جەماوەر لەحیکایەت خـــوان بیزار دەبوو .. چونکە لە بازنەی گێڕانەوە زیاتـــر دەرنەچوو بەڵام حیکایەت خوانی ئەم شانۆگەریـــە چێژێکی زۆری لە گێڕانەوەکەدا دروست کردبوو وای لە جەماوەر کردبوو کە چاوەڕوانی حەیرانو دەف لێ دانەکەی‌بن . سەرەڕای ئەوە ئەکتەر لەناو جەماوەردا دانشتبوو بە تەواوی جوێ نەئەکرانەوە کە ئەوانە ئەکتەرن تا کاتێ خۆیان بە جەماوەر ناسان و کەوتنە باسی خۆیان : « ئەمن مەمەندی جەوهەردارم کـارم گەڵێ لکاکەو فرۆختم هەن ، ئەمن میرزا عەباســـی ئەوقاتمو بۆخۆم خوینەوارم » .

ئەوەی شایەنی باسە تا ئێستا زۆربەی ئـــەو شانۆگەریانەی کەلەسەر شانۆپێش کـــەش‌کـــراون ئەنجامێکی میلۆدرامی داوە بەدەستەوە ، یان چەنـــد بەرهەمێکی کۆمیدی بێ ڕێو جێ ، تەنیا بۆ یاری کردن بە هەستو نەستی خەڵـــكو دلخۆش کردنیـــانو

پێ‌کەنینیان .

بەڵام « خەجو سیامەند » بە نووسین‌و دەرهێنانەوە لەوان تێپەڕبووە ، تراجیدایەکە کارتێ کردنێکی گەورەی هەیە بۆ هەڵوێست‌و دروست کردن ، هیواداریشم کە ئەمە سەرەتایەك بێت بۆ ڕاهاتنی جەماوەر ، بەم جۆرە شانۆر گەریانە .

بەو شێوەیە نووسەرو دەرهێنەر یە گیربووبوون بۆ پێش کەش کردنی ئەو شانۆگەری‌یە سوود بەخشە ، بەڵام وەکووبۆم دەرکەوت دەرهێنەر، ئەوەی لەدەقی نووسینەکە لای‌دابێ تەنیا ئەوەبووە کە پارچە هۆنراوەی دوایی :

**ئەگەر بەدڵ مەبەستانە**
**خەجی خەجان هەڵ نەدێرن**
**باهەمووومان عاشق بین**
**ئاگری خۆشەویستی ئەو لە کەلینی دڵمان‌دابێ**

گوێچکەی بیری بە ئاگامان بۆ سەرگوزشتی
ئاکامی ئەو دوودڵداره ڕادێرێن

**خەج کیژێکی دەروونو دڵ فراوانە**
**خەج کاباتی مسکێنانە**
**خاتونێکی ئەمەکداری هەژارانە**
**خەج دولبەرێکی شەیدایە**
**هەتا ئێستاش**
**چاوی لەڕێی میوانداری سیامەندێکی وورپایە »**

لای نووسەر کرێکاری ناو چایخانەکە لەگەڵ چونە دەرەوەی خەڵکەدا ئەی خوێنێتەوە ، بەڵام دەرهێنەر ئەو حیوارەی داوە بە دەستە خوشکی خەج ، هەروەها سیامەند لای نووسەر هەڵئەدێریو نامێنێ بەڵام بە پێی ویستی دەرهێنەر جارێکی تر دەرئەکەوێ چونکە بەڕای ئەو هەریەك ئەنجامی هەیە ئەویش مەبەست ئەوەیە کەلەهێزی درامی چیرۆکەکە دێتە خوارێ ئیتر ئەگەر دەریش بکەوێتەوە گرنگ نی‌یە چونکە ئێمە ئەو حەتمیەتە ئەزانین کەئەو بە خەج ناگات .

**دیکۆر**

شێوێنی ڕوداو کەبە شێوەی دیمەن‌و ڕووناکی بەڕووناکی خستنە سەر لەگەڵ قسەکانی حیکایەت خوان بۆ گیرانەوەی کارەساتەکان ، ماڵی بابی خەج بوو کە بەدیوەخانێکی ڕازاوەو تەختی میری لێ‌دانرابوو . دووەم ماڵی سیامەند بوو کەچیغێکی کوردی‌و هەوجاڕو گاسن‌و گۆزەو کوپەڵەی تیا دانرابوو لە پشتیشەوە شاخی کێڵە سیپان بە خۆی‌و

دارو درختەوە جگە لەوان کوورەی ئاسنگەرو دەسگای پینە دۆز کەئەمانە کاتی ڕوداو ڕۆشن ئەبونەوەو شوێنەکانی تر تاریك ئەبوون هەرچەندە زۆر قەڵە بالغ کرابوو .

**ئەکتەرەکان**

دەوری سیامەند دەورێکی عاتیفی‌و پڕ لە میسالیەتی خۆشەویستی وشتی کلاسیکیانەبوو کە ئەبوو لەسەرو چاوبا بەدی بکرێ‌و ئیحایەك بدات کەچی بە پێچەوانەوە تەشونوج لەگیانی ئەکتەردا دروست بووبوو هەروها لەگەڵ وەسفەکانی حیکایەت خوان‌دا نە ئەگونجا کەکوڕێکی مووڕەش ڕووخۆشی .. بێت .

ئەمەونزۆری تری تەکتەرەکان وەك باوکی خەج بووبوونە هۆی ئەوەی کەئەو گرێ درامیەی نووسەر بەرەو بەرز بوونەوە ئەبرد بەڵام ئەمان ئاسانیان کردووایان نیشان نەئەدا .

ئەم بەرهەمە « فواد مەجید » نووسیبووی‌و « ئەحمە دسالار » دەری هێنابوو « عوسمان چێوار » یش یارمەتیی دەرهێنانی دابوو ،

تیبی شانۆی پێشرەوو بە هاوبەشی تیبی‌شانۆی زانکۆ پێشکەشیان‌کرد .

سەرچاوەکان

(١) دەقی شانۆگەریەکە لەگەڵ بینینی‌دا بۆ چەند جارێك
(٢) ئەو دودێرە هی شاعیر « تایەربەگ » بوو
(٣) هۆنراوەیەکی مامۆستا هێمن
(٤) تراث شعبی عدد «٨»

**نەهێشتنی نەخوێندەواری وەدی هێنانی بەگیانی دیموکراتیەتە لە خوێندن**

# چیرۆك

# «جەمبەلی کوڕێ میرێ هەکاریا و بنەفشێ»

حمدي عبدالمجيد

**ئەمێ دەست بڤێ چیرۆکا ها بکن وەکی چیرۆك بێژێ کوردستانێ دەست ب هەمو چیرۆکا دکن . هەبو نەبو کەس ژ خودێ مەستر نەبو**

ئێلەکا کوردا هەبو سەرۆکێ وێ ئێلێ دگۆتنێ دەروێش ئاغا رۆژەکێ بەری رۆژ هەلاتنێ دەست دا مەسینێ خوە و چو ژ دەر ڤەدا دەست نڤێژێ بگرێ لدۆرا خوە نەری چ بنێرێ سوبحان ژ خودێرە کەچەك دیت بەژن درێژ نوڤ زراڤ رەش ئاور شەوات برۆ کەڤان دفن چلاکی کەماخ کیڤرۆشك لیڤ تەنك وەکی یەرکا چڤارێ ددان مراری خزیم زێر مەش ئۆردەك وەکی هێکا نەما .

زو زو دەرولش ئاغا ڤەگەرا ئالیێ مالێ پرسیار کر ژ بەردەستی و مفردین (١) خو : هون نزانن ئەڤ کەچا ها کەچا کێ‌یە ؟ .

**مفردی و بەر دەستیا گوتێ ئاغا ماهش و بیرێ تە نەمانە ؟ یان چاڤێ تە طاری بویە ؟ هەی خودێ هشتو ما کۆراییێ ب چاڤێ تە دە هاتیە ؟ یان طەمیا مرنێ تو گرتی ، نێ ئەو دۆتماماتە بنەفشا کەچا فارس بەگێ یە !! .**

هەر زو دەروێش ئاغا شیاندە دوڤ فارس بەگێڕە ئانی مالا خوە ئالیێ مالێ و زێ خوەست کو کەچا خوە بنەفشێ بدێ ب ژنێتی و گوت ئەزێ چوکێ هەمو حێشترا ڤەکم ژ گریدانێ وهەسپا بەردم ژ طەولخانێ و کەرێێ پەزی بەردم ژ گوڤێ بەرخا بەردم بەر ماکا و ئەزێ هەمویان دەرخینم هێشیا کونێ رەش ئەگەر مرۆڤ بێژن ئەڤ چیە ؟ ئەزێ بێژم ئەڤ ڤەلەنێ دۆتماما من بنەفشێ یە !!

مامۆ ئەگەر تو ددێ من بدە من ئەگەر تو نادێ من ئەزێ ژ تە بستینم ب دارێ زۆرێ !!

**پشتی فارس بەگ ئەڤ گۆتن ژ دەروێش ئاغا بهیست هاتە سالا خوە گازی کورێ خوە یێ مەزن محەمەد ئەمین و کەچا خوە بنەفشێ کر و گۆتە وان دەروێش ئاغا گۆتیە من : هەر چەندە تە حەفت کور هەنە لێ بەلێ دڤێ تو بنەفشێ بدێ من ، ئەگەر تو نەدێ من ئەژێ بدارێ زورێ ژ تە بستینم !**

چاخێ محەمەد ئەمین ئەڤ گۆتن بهیست گۆت : یابۆ ئەر سوند دخوم بناڤێ خودێ نیشەڤ ژ خونێ ئەزێ تێکەڤم ناڤ ئێلێ مێرا بکوژم ئەزێ‌وە بکم کو عزرائیل داکەڤێ عەردێ و نەما کەس بزانێ کی کورێ کێ یە .

فارس بەگێ گۆت : لاوێ من ئەم نکارن وا بکوژن ئێل گشت یادروێش یە یا باش ئەوە ئەم ژ خومڕە برەڤن هەرن .

ژ دێلا کو ئێلێ بکوژن ژ نیڤی شەڤێ پێڤە بارکرن و یا الله و یا خودێ بڕێکەتن ، چاخەکی نەڕین کو گهانە دەشتەکە راست یێ مرۆڤ مێرگەکا لێ گیایێ وێ بۆستەکێ رابویە تژی گانگلۆك و بلبزێك و خەجخەجۆك و کولیکێ هەسپا و نیسانێ یە (١) .

فارس بەگێ گوت : ب خودێ ئەمێ بهارا خوە یا نیسال ل ڤێدەرێ ببورێنن حەیا هاڤینێ صەد کون بێ خودان دمینن .

دەروێش ئاغا سەرێ سپێدێ زو رابو کو بنەفشا نارین دیار نینە هیچ هش و بیر ل سەریێ نەمان زو صەد سوار ب خوەڕە راکرن‌و ب دوڤ شۆپ و دەوسا نبەفشێ کەت .

رۆژکێ ل کاریێ گەوکێ دۆرا کۆنێ فارس بەگێ گرت .

فارس بەگ وەکی جارا ل بەر ڤەهوا خوە

رونشتیە ئەهوێ چێدکێ ... بنەفشێ دەرکەتـــە هێشیا کۆن ج دەرکەڤن دیت ج قیر و قیامەتە سوارا چاوە دۆرا کونێ وا گرتیە !!

بنەفشێ خوە نەگرت دەست ب گریێ کـــر ب هەردو چاڤا گریا فارس بەگ دەنگێ گریێ وێ کـــر گۆت چما دگریێ کەکا من ! گۆ بابۆ ما چما ئەز نەگریم ئەڤا دەروێش ئاغا سوارێ خوە ئینانە وێ وە بکوژێ و من ب کوتەکی ژ خومرە ببێ !!

فارس بەگ گۆ : واللە ئەمێ شەرێ خوە بکن خودێ ج حەز کریە بەطال نابێ .

فارس بەگ دگەل حەفت کورێ خوە کەتن پشتا کۆنێ خوە و شەرێ خوە کرن .

**جەمبەلیێ کورێ میرێ هەکاریا دگەل صــــەد سواران هاتنە رەفو نێچیرێ کومێ خوە خوار کرنە ل ناڤ چاڤێ خوە دانینە هایێ وان ژ بایێ فەلەکێ نینە تاژیێ و تولێ وان ب وارەنە وێ ژ ڤێ بانیێ و دیاری و بەصاریێ د چنە بێ دیێ .**

ژ نشکێ ڤە چاڤێ وان ب کونێ فارس بەگێ کەت ل ناڤ ئاخا ویێ دە ڤەدایە و ل هێل و تەنشتا کۆن ج قیرو قیامە تە !

جەمبەلی گۆتە سوارێ خـــوە ئەز جەمبەلیێ کورێ میرێ هەکاریا مە ئەز هەسن ب ساریێ دچمینم ئەڤ کیە هاتیە سەر ئاخا من بێ ئاگەیا من ، دێ هەرن ڤی کۆنی کا ئەڤ کیە ؟ ما ناڤو و دەنگێ من نە بهیستنە ج حساب ژ منرە نە کریە کۆنێ خوە ل سەر عەردێ من ڤەدایە ، مە ئیرۆ رەڤ و نێچیر نە لازمە .

چاڤێ گەهشتن دۆرا کۆن و گاڤا چاڤی بنەفشا نارین ب وان کەت چو پێشیا وان و ب سێ دەنگا ژ وارە لیلیاند .

چاڤێ چاڤێ جەمبەلیێ کورێ میرێ هەکاریا ب بنەفشا نارین کەت هشێ وی و ل سەر سەرێ وێ دانی .

جەمبەلی گۆتە بنەفشێ خێرە ج ب وە هاتیە هون ج کەسن ؟ .

بنەفشێ گۆت : واللە ئەم ژ بەر دەروێش ئاغـا رەڤینە د ڤرە دەرکەتنە ئەو ب دوڤ مە کەتیە هاتیە وێ باڤ و برایێ من بکوژێ و ب دارێ زۆرێ من ژ خومرە ببێ و ئەز ب وێ قایل نابم .

جەمبەلی گۆ : کیژان سوارێ مالا باڤێ تە نە ؟

بنەفشێ گۆ : ئەوێ ها لە .

**ژ بەریڤە دبێژن هەر کەسەکێ د عەردێ خوە دە خورتە جەمبەلی ب سوارێن خوە ڤە کەتن نـــاڤ سوارێن دەروێش ئاغا دە ژێک بەلاڤ کـــرن مێرێ ڤەنج ئەوبو ژ مالا خوە نە هاتی .**

**فارس بەگ دگــــەل کورێن خوە و ســــوارێ جەمبەلی ڤە هاتن ل پێش کۆن یەیا بون و هاتن بـــن کۆن رونشتن . فارس بەگ خوارن ژ وانرە چێکر و خوارنا خوە خوارن .**

فارس بەگ گازی کورێن خوە کر و گۆت : لاوێن من ئەڤ جەمبەلیێ کورێ میرێ هەکاریا بە ئـــەڤ قەنجیا گەلەک مەزن ل مە کر دڤێ ئەم قەنجیا وی ژ سەر خوە راکن دڤێ ئەم بنەفشێ بدنێ . کا هون ج دبێژن ؟ .

محەمەد ئەمین گۆت : کا ئەم باکنە بنەفشێ دا وەکی جارا دن ل مە نەکێ .

چاڤێ بنەفشێ هات گوتێ مە نشتەکی وهـــا کریە دلێ خوەدە ب دلێ تەبە یان نە ؟

بنەفشێ گۆ : هەما من بدەنێ ما هونی ما هونێ ج ل من کەڤنە ژنێ بکن .

فارس بەگ هاتە نک جەمبەلی و گۆتێ : تە ئیرو جانی مە پاراست و قەنجیەکە مەزن ل مە کر ژ بەر ڤێ قەنجیێ ڤە من کەچا خوە بنەفشێ پێشکێش تە کـــر رابە ل پشت خوە سوار کە و ژ خومرە ببە .

جەمبەلی گۆت : من ژ تە قەبول کر لێ بەلێ ئەز ب خومرە نابم ئەز کورێ میرێ هەکاریا مە خەلکـــێ بێژن کا ئە ڤ کەچا شڤانەکی یە یان گاڤانەکی بەتەگەر نە ب داوەت و شاهی و دەهۆل و زرنە بێ ئەز وێ نابم ، ئەڤ ئین نا دی ئەزێ خێلی و بەربوکێ خـــوە بشبێنم دا ژ منرە بینن .

فارس بەگ گۆت : تو ب کارێ خوە دزانێ .

جەمبەلی چو مالا خوە و دەهۆل و زرنە ل دار دانی .

دەروێش ئاغا ل نک وی صـــەد سوار بێنـــە کوشتن نە غەما وێ‌یە هایێ وی لێ نیتە ، چاڤێ وی بنەفشێ کەتیە . جارەکا دی نیڤێ شەڤێ هەزار سوار ب خومرە هلانین و بەرێ خوە دا بن کـــۆنێ فارس بەگێ .

هنەک دبێژن هەمو تەڤدە کوشتن و هنـــەک دبێژن تەڤدە راکرن دگەل بنەفشا نارین برن .

ئەو ئین بوری ئینا دی سوارێ جەمبەلی دگەل خێلی و بەربوکا سەرە ژێر بون چون کو بنەفشێ بگوهێزن ژ جەمبەلیرە . جەمبەلی دەرکەتیە ســـەر بانێ قەسرێ تەماشا دکێ کا وێ کەنگی وەرن .

